ڕۆڤار
ڕۆژنامە - گۆڤار
10


نیگاری: سامان کەریم



# دڵدار...
## تەمەنێکی کورت و ئەزموونێکی زیندوو

بلاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییەو هەرژمارەی تایبەتە بەداهێنەرێک دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەری دەکات

دەستەی ڕاوێژکاران
حسێن عارف
ڕەووف بێگەرد
ڕێبین ئەحمەد هەردی

سەرپەرشتی گشتی
شێرکۆ بێکەس

بەڕێوەبەری ڕۆڤار
دلشاد عبدالله

سەرپەرشتی هونەری
قادر میرخان

کارگێڕ
عوسمان شەیدا

مۆنتاجی کۆمپیوتەر
ئاسۆ سعید

# ژمارەی داهاتوو تایبەتە بە شاعیرو مێژوونووس، مەستوورەی ئەردەڵانی

## چەند پەیڤێک

یونس ڕەئووف (دڵدار) لە ۲۰/ شوباتی/۱۹۱۸ لە ڕۆژگاری کۆتایی هاتنی شەڕی گەورەی یەکەم لەشاری کۆیە لە دایك بووە.

–ماوەیەك لە هەولێرو ڕانیەو دواتر لە کەرکوك و بەغدا ژیاوەو ساڵی ۱۹٤٥ کۆلێجی حقوقی تەواو کردووەو لە ۱۲/۱۱/۱۹٤۸ لە تەمەنی سی ساڵیدا لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە

–ئەزموونی شیعری (دڵدار) بریتی‌یە لە هەوڵدانێکی جیدی بۆ تێکەڵ کردنی ژیانی سیاسی و بیری نوێی نەتەوایەتی لە گەڵ واقیعی کۆمەڵایەتی ئەوسا

–لە ماوەی (۱۳) ساڵی نووسین دا دڵدار چەندین پارچە شیعرو، چەند کتێبێکی نووسیوە بەهەردوو زمانی کوردی و عەرەبی

–دووجار دیوانی دڵدار لە لایەن گیو موکریانی لە چاپخانەی کوردستان چاپ کراوە لە ساڵانی ۱۹٦۱ و ۱۹۷۱ دا.

–یەکێك لەکارە دانسقەکانی (دڵدار) جگە لە شیعرەکانی بریتی‌یە لە نووسینەوەی یاداشت و بیرەوەری‌یەکانی خۆی، کە بەشێکی چاپکراون و ئەو بەشەی تریش کە تایبەتە بەگرنگترین ماوەی ژیانی لە کەرکوك و بەغدا دیارنین و بەپێی هەواڵێك کە (ڕۆڤار) زانیوویەتی ئەوبەشە ئێستا کەوتۆتە لای برایەکی ڕۆژنامەنووس لە هەولێر بەو هیوایەی لە نزیکترین فرسەت دا ڕووناکی ببینێ

–عبدالخالق علاءالدين لە ساڵی (۱۹۸٥)جارێکی تر زۆربەی بەرهەمەکانی (دڵدار)ی چاپ کردۆتەوەو بە چەندین وێنەو دەستخەتی شاعیر کتێبەکەی دەوڵەمەند کردووە.

سیاسەت هێندە خزاوەتە ناو دوو توێی ژیانی دڵدارەوەو بەئەندازەیەك تێکەڵ بە چینە زەحمەتکێشەکان بووە، کە کاری کردۆتە سەر شیعریەتی و ئەو کاریگەرییەش لە شیعرەکانی دوا تەمەنی‌دا لە نێوان (۱۹٤٥–۱۹٤۸) بنەڕەتی دیارە، (دڵدار) لە شیعری (ئەی ڕەقیب) کە کراوەتە سروودی نەتەوایەتی گەیشتۆتە ترۆپکی بیری نەتەوایەتی لە داڕشتنی شیعریداو لە شیعری (خەندەکەی بایی) گەیشتۆتە ترۆپکی شیعریەت لە ئەزموونی خۆیدا.

–(دڵدار) ئەزموونێکی دەوڵەمەندبوو، جێگەی داخە بە جوانەمەرگی سەری نایەوەو ئەو ئەزموونە نەگەیشتە مەنزڵ.

ڕۆڤار



### سامان کەریم دارتاش

–۱۹٦۱ لە سلێمانی لە دایك بووە.
–۱۹۸۸ ئەکادیمیای هونەری لە بەغدا تەواوکردووە–بەشی نیگارکێشان.
–۱۹۸۸ پیشانگەیەکی هاوبەش لە گەڵ چیمەن ئسماعیل.
–۱۹۸۹ پیشانگەیەکی هاوبەش لە تەك جەزا بەکر.
–۱۹۹۱ پیشانگەیەکی هاوبەش لە تەك جەزا بەکرو چیمەن ئسماعیل
–۱۹۹٤ پیشانگەیەکی تایبەت لە گەلەری سالار مجید
–۱۹۹۲–۱۹۹٤ بەشداری پیشانگەیەکی هاوبەشی هونەرمەندانی کورد، ئەمسا–گراتس
–۱۹۹[illegible] پیشانگەیەکی هاوبەش لە گەڵ هونەرمەندان سەر ڕەت ئەنوەر سەوزو مدحت کاکەییدا. لە سلێمانی
–۲۰۰۰ پیانگەی هاوبەش لە گەڵ هونەرمەند سەروەت ئەنوەر سەوز لە مۆزەخانەی سلێمانی
–لە ۱۹۹۱–۱۹۹٥ مامۆستای پەیمانگەی هونەرەجوانەکانی سلێمانی بووە

**تێبینی :**
بۆ ئامادەکردنی ئەم ژمارەیە سوودمان لە کتێبی (دڵدار، شاعیری شۆڕگێڕی کورد) نووسینی عبدالخالق علاءالدين وەگرتووە.

(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیری‌یە
هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر
دوومانگ جارێك دەری دەکات
ناونیشان
سلێمانی -فولکەی یەکگرتن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم/ ڕۆڤار
ت / ۲۹٦۰۹-۲۹۸۳۹
لەدەرەوەی کوردستان
Tel: 0044162846008
Fax: 00441628477660
چاپخانە : ئۆفسێتی دلێر

# دڵدار

## بەقەڵەمی خۆی

دەمنا دەم ئینسان خۆی لەهەموو ئەو موحیتەی کەتێیدا ئەژی رزگار دەکاو لەو شتانەی کەلەدەوریایە دوورئەخاتەوە، تاوای لێدێت غەیرەز (خۆی) ئەبێ چیتری بەمێشکدا نایێت بەچاوێکی تیژەوە سەیری پاشەڕۆژ دەکات کە پردەهای ئەقدارن و هێندە لەسەریەك و زۆرن کەئەك بەچاوی ئیعتیادی تا بەچاوی ئەندێشەش ناتوانرێ ئەمەی کەلەودیوی شارراپێتەوە ئەوساکە هەروەك هەورێکی ئەزانین دڵی ئینسان داگیر دەکا تروسکەیەکی دووری ئومێدی ژیان لەمێشکی ئەوکەسە ئەچەسپێنێ جا بەتینی و بێ تێنی ئەم تروسکەیە بەدڵی ئەوکەسەو ئامانجەکانی ئەو حاڵەتی ژینیەوە بەستراوە هەروەکو ئینسان سەیری دوارۆژی دەکا، بەچاوێکی پڕ حەنانەوە سەیری رابردووشی دەکا بێشك سەفەحاتی ژیانی یەك هەڵئەداتەوە. هەرچیەکی کەزاکیرە بەخەتێکی ئاشکار بۆی نووسیبێ ئەیخوێنێتەوە وەحەوادیسی رابوردووی دێتەوە یاد، ئایا ژیان بێجگە لەزنجیرە حەوادیسێك زیاتر چیترتان بەمێشکدا دێ کەتەعریفی پێ بکەن؟ باوەڕناکەم..

لەساڵی "١٩٣٨" وەکو ئیمڕۆ کەدەستم دایە قەڵەم کەبەموناسەبەتی عومری بیست ساڵەم موزەکەراتم تەسجیل بکەم چوار لاپەڕەم ڕەش کردەوە، بەڵام مەوسمی کۆشش و خۆبۆ ئیمتحان ئامادەکردن بوو بەنیوەچڵی بەجێم هێشت. کەچی لەدواجارا ئەو دەفتەرەی کەموزەکەراتم تێدا نووسیوە گەلێ شتی بەقیمەتی تێدابوو لێم ون بوو نازانم کەکام دەست ئەم خەزێنە بەنرخەی لەدەست دام؟

وائەم جارەش بەموناسەبەتی ئەوەی کەلەمونتەهای کولیەی حقوقم و ئەمە ئەخیر ساڵمە کەخۆم بەقوتابی دائەنێم، پاش مانگێکی تر ئەم لەقەبە پیرۆزەی کەساڵەها پێمەوە نووسابوو، ئەویش "قوتابی" لەسەرم لائەچێ، دەستم کرد بەنووسینەوەی موزەکەراتم، هەموو ئومێدم وایە کەچ حەلقەی زنجیرەی رابردووم لێ ون نەبووبێ لەگەڵ ئەمەش ناحیەیەکی زۆر موهیمم لەژیانا لانیە کەئەویش تەئریخی ئەو رۆژانە نازانم کەحەوادسی لێ قەوماوە، چونکە لەوەختی خۆی ئەم تەریخانەم لای خۆم تەسجیل نەکردووە، بەڵام لەوە ئەمێنم کەئەتوانم وەکو شەخسێکی ئەجنەبی سەیری یونس رەئووف بکەم و زۆر بەئەمینی موزەکەراتی بنووسمەوە مەرازیشم لەمە ئەمەیە کەرێگەی عاتیفە ئەدەم کەیاری بەقەڵەمم بکات و شتێکی نەقەوماو بخەمە ریزی قەوماوەوە، وەشتێکی قەوماو بخەمە پایەی نەقەوماوەوە، دیسان زۆر هەوڵی ئەوە ئەدەم کەبەتەرتیب ئەم موزەکەراتە تەسجیل بکەم، تابتوانم عیللەتی گەلێ شتی پێ تەفسیر بکەم، جا نازانم لەمە موەفەق ئەبم یان نا ئەمەش عائید بەخوێنەوارانە.

### لەدایك بوونم

من ناوم یونس رەئووف کوڕی مەحمود کوڕی مەلا سەعیدم لەبنەماڵەی "خادم السجادین" لەرۆژی ٢٠ی شوباتی ساڵی "١٩١٨" لەکۆیە لەدایك بووم، دایکم ناوی "زهوە" کچی خورشید افندی‌یە، فامیلیای دایکم عەلەم زادەن و لەزەهاوەوە هاتوونەتە قەراغ زێی کۆیە وەئیسکانیان کردووە، تا حاجی قادری کۆیی مەشهور لەم فامیلیایەیە، ئێستاش ئەم تیرەیە کەلە "کانی لە لە سێگردکان، سێکانی، ئۆمەرگومبەت" دائەنیشن بە "دەربەندی" ئەناسرێن بەزوبانێك قسەدەکەن کەنزیکی "باجەلانی"یە گەلێ خزم و ئامۆزای لە کانی لەلە هەیە، کەدێنە کۆیە دایکم زۆر بەچاوێکی بەسۆزەوە سەیریان ئەکاو خۆی پێیانەوە هەڵئەشەنگێنێ، باوکی دایکم خورشید ئەفەندی هەر بەمەئموریەت مەشغوڵ بووە وائەڵێن کەکاتبێکی چاك و پیاوێکی عاقڵ بووە، دایکم ئافرەتێکی دڵنەرمی جارجار زۆر تووڕەی سەخی، بەتەدبیرەیە، بێجگە لەمەش زۆر موتەحەمیلەیە، وەعیزەتی نەفسێکی زۆر نادری هەیە. ئەڵێم من لەبیستی شوباتی ساڵی ١٩١٨ لەدایك بووم، وەختی لەدایك بوونم تەسادوفی نیهایەتی گرانی و لەبەهارا بووە، دونیا زۆر بەترس، خەڵقی زۆر برسی و پەرێشان بوو تائیمە کەبەشی خواردنی خۆمان دەغڵمان هەبووە، لەو رۆژانەدا عەسکەری عوسمانی شوێنی "چاڵەکانی" پێی زانیوە هاتوون هەموو دەغڵەکەمانیان بەتاڵان بردووە زاتەن لەدوا رۆژانی حکومەتی عوسمانی باوکم لەگەڵ قائیمقامی کۆیە لەسەر مەسەلەیەك تێکچووبوو، لەسەر ئیشارەتی قائیمقام بەناوی مەئموریەتی نفووس لەکۆیە نەهێشترابوو، لەرانیە بووە، برای هەرەگەورەم سەعدی ئەگێڕێتەوە ئەڵێ: لەو رۆژەی کەلەدایك بووی خەبەرمان بۆ هات کەدەغڵەکەمان حکومەت بردی و هیچمان ئەما، باوکیشم لەکۆیە نەبوو مەجبور ماین کەئەشیای ناوماڵ بفرۆشین و دەغڵی پێ بکڕین و خێزان ئیدارە بکەین تا خەرمانی تازە بەرکوت ئەبێ، پاش شەش مانگ ماڵی ئێمە چووەتە رانیە لەوێندەر (ئەوعەئما) خۆمان گرتەوە.



لەدواجارا عوسمانی شکاوەو وڵاتی ئێمە بەهودنە ئیحتلال کرا، مەئمورینی ئەوێ قبوڵی حوکمی ئینگلیزی کرد، مایەوە ئەوەی قبوڵی نەکرد پەراکەندە بوو، ئێمە یەك لەو پەڕاگەندانەبووین، باوکم بەتەنها فیراری کردبوو لەرانیە نەمابوو ماڵی ئێمە بەحیمایەتی فتاح بەگ -لەدواجارا بەدەستی ئینگلیزەکان کوژرا- لەرانیە مابووەوە لەپاشان بەشەوێکی زۆر ناخۆش بەدزی

بارمان کردووە هاتۆتەوە کۆیە، من ئەوساکە عومرم ساڵە وەختێ بووە، باوکم وا چووبووە عەقڵیەوە کەمادامەکی حکومەتی ئیحتلال موتەوەقیفی سەر (ئیستیفتایە) هەر حکومەتی عوسمانی دێتەوە ویلایەتی موسڵ هەر بەو ئیعتقادەش بووە کەوەزیفەی لەحکومەتی ئیحتلال قبوڵ نەکرد، بەڵام لەلایەکی تریشەوە حیسی ئەمەی ئەکرد کەئەگەر لەکۆیە بێ تووشی زەرەر ئەبێ لەبەر ئەمە لەپێش گەڕانەوەی ماڵی ئێمە بۆ کۆیە ئەو چووبووە هەولێر لای مەلا ئەفەندی، مەلا ئەفەندیش گوندێکی کەناوی "بێستانە"بوو دایێ کەزەراعەتی لێ بکات و بحەوێتەوە. ماڵی ئێمە هەندە لەکۆیە گیرنەبووبوو کەباری کردبوو بۆ بێستانە من خۆم بێستانەم بەفکر نایەت وەنازانم چۆن بووە بەڵام لەسەر ئەوەی کەئافرەتێکی هەڵگیراو ئیلتیجای بەماڵی ئێمە کردبوو پیاوانی شێخ مارفی "هەڵەجە" ویستبوویان کەبیکوژن و ئێمەش مودافەعەمان کردبوو پیاوەکانمان دەسگیرکردبوو لەمە شێخ مارف کەخەزوری احمد ئەفەندی موتەسەریف بوو عاجز بوبوو وەاحمد افندی ئامۆزای مەلا ئەفەندی بوو بەو موناسەبەتە مەلا ئەفەندی دڵگیرو بێستانەی لەئێمە ساندبۆوە، باوکم خودا عەفوی کا پیاوێکی زۆر خزمپەروەر بوو زوو توڕە ئەبوو وەزووش ئاشت ئەبووەوە، بەمە ئیقناعی کردبوو کەبێتە هەولێر دابنیشێ. لەو تەئریخەشدا خاڵم عەبدوڵا ئەفەندی و جەماعەتێك دوو زابتی ئینگلیزیان کوشتبوو، خاڵۆم ئیعدام کرابوو ئەم مەسەلەیە زیاتر باوکمی هاویشتبووە سەر ئەمە کەزیاتر ئیحتما بەمەلا ئەفەندی بکات چونکە ئیعتقادی ئینگلیزەکان وابوو کە عەبدوڵا ئەفەندی خاڵم لەلایەن عوسمانی پەروەرەکانەوە تەحریز کراوەو باوکیشم زاتەن یەك لەو عوسمانی پەروەرانە بوو. ماڵی ئێمە هاتە هەولێر بەڵام لەنیهایەتی پەرێشانی و رووتی.. هەرچەندی دەکەم هەر خۆم لەهەولێر دێتەوە یاد، وام دێتە بەرچاو کەلەخانوویەکی حەوشە زۆر بەرین، لەدەرگای حەوشەکە ئەهاتیە ژوورەوە لای دەستە راستت مەتبەخێکی تاریکی دیوار رەش و لەتەنیشتی راستی مەتبەخەکە کەلاوەی دوو هۆدەی رووخاوت ئەدیت، لای دەستەچەپت هەیوانێکی بڵندو کەلەگێکت چاو پێئەکەوت، دوو هۆدەی درێژو بەرین لەوبەرو ئەمبەری کەلەگێکەدابوو دەرگایان دوودەری لەسەر کەلەگی و پەنجەرەشیان لەسەر هەیوانەکەدابوو، لای راستی هەیوانەکە قادرمەیەکی درێژ هەبوو کەبۆسەربان ئەچوو، هەروەها قادرمەی ئەم پەیژەیە خلیسك بوو، لەبن قادرمەکە تاقێك کرابوو کەجێگای کوپ بوو، مەتبەخ و هەیوانەکە روو لەیەکتر ئەمبەرو ئەوبەر کەوتبوون لەناوەندی حەوشە بەرینەکەدا کۆسپەیەکی چوارسووچی گەورە هەبوو کەپایزان و ماڵ لە حەوشان لەسەری ئەنووستین، خۆم لەیادە کە پاوانەم لەپا بووەو کۆچکم لەسەر بووە پێش چاوەکەی کۆچکم پلێڵەی زیو بوو تازە بەسەرپا ئەکەوتم ئەرۆشتم و بەرئەبوومەوە، منداڵێکی هەراشی ئەسمەری دەموچاو خڕۆکاوی دەستی ئەگرتم و راستی ئەکردمەوەو گۆرانی بۆ ئەوتم و ئەیدواندم، دیواری خانوەکەم هەر لەبەرچاوە کەکۆن و کەل و کۆم بوویانەکەمان بەرین و ستارەداربوو ئەمە یەکەم لاپەڕەی یادمە کەبۆتانم بەیان کرد. جارێکیان ئەم وەسفەم بۆ دایکم کرد وتی، رۆڵە فیکرت زۆر تیژە ئەمانەت چۆن لەیاد ماوە؟! لەلەیێکی ئافرەتم هەبوو کەناوی (فاتمی سیدی)بوو من بانگم دەکرد (واوەی سیدی) زۆرم خۆش دەویست تائێستاکەش کەدەچمە ماڵی خوشکم لەهەولێر فاتمی سیدی ئەبینم حەنانی منالیم بۆی ئەبزوێ و حەز ئەکەم کەخۆمی فڕێدەمەوە باوەشی لەگەڵ ملوانکە زەردو سورەکانی یاری بکەم بەڵام هەیهات ئەمن وابچووك مامەوە کەلەباوەشی ئەو جێم بێتەوە ئەئەو ملوانکەی زەردو سووری‌ماوە چونکە زۆر پیربووە وا بای لەسەر لێوی قەبرە، تاکو ئێستا ئەم چەند وشەیە ئەنووسمەوە دەنگی شەریبی واوە سیدم لەگوێدا ئەزرنگێتەوە کەچۆنی ئەنواندم و دەستی لەپشتی ئەدام یا سەری ئەخوراندم ئەی‌وت "پسکۆ.. بنوورە، چ گورگ لەماڵ نی‌یە دەنگی بلوێری شا دێت!!" حەقیقەتەن

ئەم دەنگە بۆمن دەنگی ئەو بلوێرە خۆشەیە کەهەر لەرێنەوەی حەلەقەیێکی عومری رۆیشتوومە. بەراستی دەنگێکی دلارام و ئاسود بوو وام لەدایکم بیستووە کە من زمانم پشکووت و بەسەرپا کەوتم زۆر فەسیح و قسەزان بووم بەڵام لەعومری چوار ساڵیمدا بەنەخۆشێکی زۆر گران کەوتم ساڵێك ئەم نەخۆشیەم تەقسیلی کێشاوەتەوە کەچاك بوومەوە لاڵ بووم لەدواجارا کەزوبانم کراوەتەوە بەو (لالەپەتەپی)یە قسەم کردووە، ئێستاکەش ئەم زوبان گرانەم هەرماوەوە لەگەلێك مەزایای ژیان بێبەری کردووم، من ئەم نەخۆشیەم هەموو لەیاد نەماوەتەوە هەر هێندەم لەبیرە کە "فاتمی سیدی" لەباوەشی ئەکردم چارۆگەیەکی سپی بەسەردا ئەدام پێی ئەوتم: بچین بۆ بازاڕ، چیکولانەت بۆ بکڕم. لەقەڵاتی هەولێر ئەیهێنامە خوارەوە، بەلای دەستە راستا بەرێگەیێکی باریکی درێژی خۆلەپۆتی‌دا ئەبردم تا ئەگەیشتینە خانوێکی زۆر گەورەی دیوار سپی، خەلقێکی زۆر تێدا کۆبیبووەوە بۆنێکی ناخۆشی لێوە ئەهات ئەمزانی ئەوێ "خەستەخانەیە" ئەگریام و ئەمووت "ناخۆمەوە،، ناخۆمەوە." هێندەی پێنەئەچوو کەپیاوێکی سوورووسپی قەڵەو دەهات و ناوی (ئاڵتون ئەفەندی)بوو لەباوەشی فاتمە سیدی وەرئەگرتم، لەژوورێکی بەریندا لەسەر مێزێکی سپی درێژی ئەکردم لووتی ئەگرتم و ئاوێکی سپی زۆر ناخۆشی بەگەروودا ئەکردم، لێم ئەئەگەڕا تا قووتم ئەدابایە ئینجا ئەیدامەوە سیدی فاتمی، سیدیش بەماچکردن و لاواندنەوە ئەیبردمەوە ماڵەوە لەناو جۆلانەیەکی بادا درێژیان ئەکردم و رایان دەژاندم، هەروەکو عەرزم کردن کەبۆ من تەسادوفی دەوری فەقیری و دەربەدەری فامیلیای ئێمەی کردووە هەر لەو فەقیریەش گەورە بووم، خێزانێکی زۆری وەك ماڵی ئێمە لەهەولێر، بەکلاودروەتی و موساعەدەی مەلا ئەفەندی بەرێوە دەچوو. لەگەڵ ئەمەشدا عیزەتی ئەفسی عائیلەوی و خۆ بەکەم دانەنانمان هەر موحافەزەکردووە، قەناعەت و رازیبوون شیعاری ژیانمان بووە، من لەسەر ئەم قەناعەتە پەروەردە کراوم، لەجیاتی شیرینی ژیان تاڵاوی فەقیریم چەشتووە تا فاتمەی سیدی لەلەم بەدەرەجەیەك ئیهتمامی بەم ناحیەیەم داوە ئیمرۆکە چ مورەبییەکی (موسەقەف) ناتوانێ کەمنداڵ وا لەسەر خوێکی باش و چاوتێری پەروەدە بکات. تەسەورکەن کەجار جار ئەچووینە قەسری مەلا ئەفەندی لەوێندەر حەلەویات و شەکریان بۆ ئەهێنام ئەك وەری بگرم بەڵکو تەماشاشم ئەدەکردن لەبەروەی ناکە گۆیا ئەمزانیبێ ئەمانە خۆشن و من لێی مەحرووم وەیا حەزم لێ ئەبووبێ. بەڵکو وام چووبووە مێشکەوە کەلەماڵی خەڵق تەماشای شتی خەڵق کردن خراپە. ئەگەر بێتو وا بکەم فاتمە سیدیم لێ عیحز دەبێ.

جارێکیتر حیکایەتی "مەڕۆکەو بزنۆکەم" بۆ ناکا. ئێستاش لەسەر عەینی خوو ماوم یەعنی ئەتوانم زۆر بەسەهلی لەگەڵ زروفی ژیانی خۆم، خۆم رێك بخەم، هێشتاکە بەفیکرم دانایێت بەتایبەتی حەزم چووبێتە چ ئەوعە خواردنێك ئیستنکافم کردبێ.. دایکم ئەیهێشتووە کەبچمە "کۆڵان" لەگەڵ منداڵان یاری بکەم بۆ ئەوەی کەلەماڵەوە عاجز ئەبم دایکم ئافرەتێکی بەخێو دەکرد دووکوڕی پارچەلەی هەبوو یەکیان ناوی "خدر" ئەویتریان ناوی "عزیز"بوو، ئەم دوو کوڕە لەحەوشەدا یاریان لەگەڵدا دەکردم ئەغلەب یاریمان عیبارەت بوو لەتەمسیلی ئاغاو نۆکەر منیان ئەکردە (ئاغا) خۆشیان ئەبوونە (نۆکەر) خزمەتکار ئیتر ئەمرم دەکردو ئەوانیش بەقسەیان دەکردم بەمە تەحەکومێکی زاتیم لەگەڵ خوێندا تێکەڵ بووە یەك لەخەسائیسی ئەسڵیم کەچەندی ئەکەم ناتوانم بێ ئەو تەحەکومە بژیم. برایەکی لەخۆ گەورەترم هەبۆ ناوی (جەواد)بوو ئەم برایەم هاتووچۆی مەکتەبی دەکرد. دەفتەرو قەڵەم و کتێبی پڕ لەوێنەکانی لەسندوقێکی بچووك دانابوو لەجێیێکی بڵندی دانابوو زۆرم حەز دەکرد منیش وەکو ئەو سندوقێکی بچووکم هەبێ کتێبی پڕ لەرەسمم ببێ وەکو ئەو بەقەڵەم و مەرەکەب بنووسم ئەیێلم کەسم ئێزیك ببێتەوە، بەڵام ئەو برایەم لەساڵی ١٩٢٦ لەگەڵ باوکما چووبوو بۆ کۆیەوە



لەوێ لەمەکتەبی ئەخوێند بەنەخۆشیەکی (موفاجیئ) وەفاتی کرد لەدوای ئەم حادیسەی وەفاتە بەساڵێك من چوومە مەکتەبەوە، با جارێك ئیستیعجال لەچوونی مەکتەب نەکەم باشە، چونکە ئەویش لەزروفێکی خاسدا بووە.. با هەندێك لەتەحلیلی نەفسیەتی خۆم بدوێم باشە، چونکە هەر خاسیەتەی کەلەخۆمدا ئەبینم سەبەبێك و موئەسیرێکی هەیە.

عەرزم کردن کەخاسیەتی خۆ زەبتکردن و تەحەکومم لەچ وەرگرتووە ئێستاش ئەمەوێ کەزیاتر لەبابەتی تری نەفسی بدوێم. بەڵام زروفی ئەوساکەی عائیلەوی ماموستای هەرەگەورەم بووەو سوڵتەی دایکم و خوشکی لە خۆ گەورەترم مورشیدم بوون. عەرزم کردن کە لە هەولێر زۆر بە فەقیریمان رابوارد حەقیقەتەن گەر کڵاو دروون نەبوایە بە هیلاك ئەچووین لەگەڵ ئەوەشا نابێ ئینکاری فەزڵی موساعەدەی مەلا نەفەندی بکەم. ئەمما دایکم ئافرەتێکی دیدە بوو خاوەنی نەفسێکی زۆربەرز بوو، هەرگیز ماڵی ئێمەی لە خزمەتکارو خزمەتچیئافرەت خاڵی نەکردووە لەبەر ئەوە من کەمنداڵێکبووم خۆم لەناو مەزاهیری زادەگانیدا دیتووە، ئەمما لەبەرئەوەی کەدایکم ئەوساکە تازەبرای ئیعدام کرابوو لەپاشان لەوەختێکیزۆر دەست کورتو فەقیریبوو هەردەم چاولەگریان و لەڕوخۆشی دووربوو منیش لەناو موحیتێکی غەم و ئەندۆ پەروەردە دەکرام شێوەیەکی (کەئابەت)و ماتیەکی تەبیعیم وەرگرت، کەدایکم ئەگریا زۆری پێ تێك ئەچووم، خێرا فاتمە سەیدی وەك یەك لەخوشکەکانم منیان ئەبردە لایەکی ترەوە ئەیانغافڵاندم حیکایەتی خۆش خۆشیان بۆ ئەکرد، لەلایەکی دامان و غەمی دایکم وەلەلایەکی کەش حیکایەتەکانی.. ئەم حیکایەتانەی کەبۆم ئەکرا ئەیانهاویشتمە ناو شەپۆلی خەیاڵاتێکی ناسوودە، تاوام لێ ئەهات زۆر جاران بەتەنها لەگەڵ خۆم ئەدوام بەمە لێم ئەترسان کەنەك شێت بم، ئێستا لەگەڵ خۆ دوانم نەماوە، هەرچەندی وەخت بەخەیاڵکردنەوە رابوێرم لام کەمە.

لەبەر ئەوەی کەلەهەولێر بەکرێ لەخانوودا دائەنیشتین جار جار خانووگۆڕکێمان ئەکرد لەخانیەکەی کەباسم بۆ کردن هاتینە دەرەوە چووینە خانوێك کەئەویش حەوشەیەکی زەلامی هەبوو، داڵانێکی درێژو لەلای دەستی چەپی حەوشەکە گومبەتێکی رووخاو کەمەرقەدێکی (حەبیبی ئەجاڕ) ئافرەتە هەوێری ئەهاتن زیارەتیان ئەکرد مۆمیان لەسەر مەرقەدەکە پێ ئەکرد، لەدواجارا باوکم رۆیی بۆ کۆیە ئێستا ئەزانم کەبەراسیتەی مەلا ئەفەندی وەزیفەی کاتبەتی نفووسیان لەحکومەت بۆ پچڕاندبوو، لەپاش باوکم جەوادی براشم چوو بۆ ئەوێ ئێمەش لەخانووی "حەبیبی ئەجاڕ" هاتینە دەرەوە چووینە خانوویەك کەزۆر گەورە بوو بەڵام هەمووی عائیدی بەئێمە ئەبوو،

بەڵکو هەر هۆدەو هەیوانێك کەسەرکۆشك بوو عائیدی بەئێمەبوو پێیان ئەوت خانووی (حاجی مەعروفی خەفاف) کەلەخانی حاجی مەعروف بووین دراوسێیەکمان هەبوو ناوی (ئامینە خانم)بوو ژنێکی لاوازی زۆر بەویقار بوو زۆرم شەرم لێ ئەکرد ئەویش زۆری خۆش دەویستم کوڕێکی هەبوو ناوی (ئەمین)بوو زۆر پاك‌و خاوێن‌و بەئەدەب بوو هەموو ڕۆژێك ئەچووە مەکتەب هەموو ڕۆژێك بەپێش پەنجەرەی ماڵی ئێمەدا ڕائەبوورد گەلێکم حەسوودی پێ ئەبرد چونکە ئەچووە مەکتەب.

جار جار بەدایکم ئەوت (ئەمنیش ئەچمە مەکتەب) ئەیوت.. (باباوکت بێتەوە دەتنێرم بۆ مەکتەب) هەر چاوەڕێی باوکم بووم بێتەوە بەڵام بێ فائیدەبوو تاپاشی شێن‌و واوەیلایەکی زۆر دایکم قەراری دا کەئەبێ بچین بۆ کۆیە، هاوین بوو کەکاروانیان بۆ گرتین (حەوێزەی شەمامێ) کەپیاوی مامم بوو ئێمەی برد بۆ کۆیە، هەروەك عەرزم کردن ساڵی ١٩٢٦ بوو کەجەوادی برام وەفاتی کردبوو وەلەعەینی ساڵیشدا بوو کەچووینە کۆیە دەم‌و چاوی تازە تازە ئەهاتن ماچیان دەکردم دایکم پێی ئەوتم ئەمە پوورتە -سیم العزاری- خوشکی مامم بوو یان ئەمە ماموژنتە یان ئەمە ئامۆزاتە یان ئەمە -خاتوونە- بەدەست خۆم نەبوو زۆر زوو ئولفەتێکم پێیانەوە گرت زۆرم خۆش دەویستن خاسەتەن مامم جەمیل ئەفەندی زۆرم شەرم لێ دەکرد، بەڵام ئێمە کەزۆر فەقیربووین مامم نەیهێشت کەبچینەوە ماڵی خۆمان، بەڵکو لەنزیك مزگەوتی پەلکێ خانوویەکی دوودەری بێ دەرگایەکی گەورەی هەبوو حەوشێکی پان‌و هەیوانێکی بڵند دوو هۆدە بەرێز یەکەوە لەناو هەیوانەکە هەبوو، بیرێك لەناوەندی حەوشەکە هەبوو کەبەسەتڵ ئاومان لێ هەڵئەهێنجا لەوێندەر دائەنیشتین ئەم خانووە باوکم بەکرێی گرتبوو عائیشەی خزمەتچی کەلەهەولێرەوە لەگەڵی هاتبووە کۆیە ئیشغالی کردبوو، باوکم لەکۆیە نەبوو بەڵکو بەمودیری تەحریرات تەعین کرابوو بۆ ڕانیە چووبووەوە، ڕانیە لەپاش وەی من لەکۆیە لەگەڵ مەحمودی ئامۆزام چاوم کراوە وەکو موراقەبەی دایکم‌و چاوی فاتمە سەیدیم لەسەر هەڵیگرابوو کەوتبوومە ژێر حیمایەتە زۆر سامی مامم (جەمیلە ئەفەندی).

مەحمودی ئامۆزام لەمەکتەب بوو وەبۆی ئەگێڕامەوە کەمەکتەب چەند خۆشە چۆن یاری ئەکەن‌و تەعلیم دەکەن -ریازە- بەراستی زۆر شەوقم چووە سەر خوێندن، کەمەکتەب کرایەوە دەسەتم کرد بەگریان کەلازمە بچم بۆ مەکتەب دایکم دەستی گرتم بردمی بۆ ماڵی (عەبدولخالق قوتب) کەئێستاکە مولاحیزی ئینحسارە لەشاری کەرکوك ئەوساکە موعەلیم بوو لەکۆیە وەموناسەبەتی خزمایەتێکی عائیلەویمان لەبەین‌دابوو پێی وت (ئەمە یونس ئەگری بۆ مەکتەب ) من بە تەمای ئەوەی کە تۆ ئاگات لێی دەبێ ئەینێرم، ها ئەمە خۆت‌ویونس ئەگەر بێ ئەمری کرد گوێ یەکانی هەڵقەنە عەبدولخالیقە ئەفەندی روتی:نا.. دایە بە دایکمی ئەوت دایە چونکە شیری ئەوی خواردبوو یونس کوڕێکی ئاقڵە ئەمە ئەگەر بێت وشتێ وا بکات من ئەزانم چۆنی عاقڵ دەکەم (ڕووی لە من کردو ووتی) : لە مەکتەب شەڕناکەیت؟ ووتم..نەء.. ووتی: هەڵنایەیت؟ ووتم نەء..بە چاوێکی زۆر بەسام سەیری کردم و ووتی:(باشە..ڕاوەستە.. تاپێکەوەبچینە مەکتەب لە ساڵی ١٩٢٧ لەعومری ٩ ساڵاندا بووم کە لە دوای عبدولخالق ئەفەندی دەڕۆیشتم وە لە حەوشەی مەکتەب دەستی گرتم بردمیە لای مودیرناوی (عبدالرحمن ئەفەندی )بوو بەتەلەبەیی قەیدی کردم لە پاشان بردمیە ژوورێکەوە کە لە سەر تەختەی درێژدرێژیان لە بەر کۆمەڵە منداڵێك دانیشتبوون زۆرترینیان لە من گەورەترو لە من بچوکتریشیان تێدا بوو موعەلیمێکی باریکەلەی سپی مووڕەش چاویلکەیێکی سپی لە چاوا بوو خەیزەرانێکی کورتی بە دەستەوە بوو لەبەردەمی مێزە درێژەکانی یەك لەدوای یەك ڕاوەستابوو، منداڵەکانیشی بە ووسکتی و(ئینتیباهێکەوە)سەیریان دەکرد،(عەبدالخالق ئەفەندی) منی تەسلیمی ئەوکرد بێجگە لە دەم‌و چاوێك ئەبێ کە ئەویش دەم‌وچاوی مەحمودی ئامۆزام بوو،ئەو دەم‌وچاوانەی کەلە سنف دا بوون هەموویانم لاغەریب بوو ئەوانیش بە چاوێکی فزولیانە سەیری ئەم قوتابی‌یە تازەیان دەکرد کە پارچە عەلی خانی یەکی لە سەری‌و سەرکەوایێکی‌مۆرو کەوایەکی(یابانی)زەرد لەبەر جانتایەکی پەڕۆی شین لەمل‌و سوورەی موورزەردیان دەکرد..

دەرسی ئەوەڵم کەوەرگرتووە لەو معەلیمە باریکەلەیە بوو ناوی (عومەر ئەفەندی)بوو دەرسەکە دەرسی ئەلف وبا بووبە ڕووپێکی بە پێکەنینەوە، بەدەنگێکی لەسەر خۆی بەتینەوە فێری حەرفی (ئەلف)ی کردین وەلەدوای ئەوە فێری حەرفی(ب)یشی کردین ئینجا لەسەرتەختەڕەشەکەی کە بەرانبەرمان بوو یەك یەك هەڵیساندین‌و فێری نووسینیشی کردین، ئینجا خۆی چەند کەلیمەیێکی لەم دوو حەرفە بۆ تەشکیل کردین بۆی نووسینەوەو بە ئێمەی ووت کەلە دەفتەرەکانماندا بینووسینەوە، عومەر ئەفەندی بەسەرماندا ئەگەڕا فێری قەڵەم گرتن‌و دەفتەر دانان‌و وەزعیەتی‌نووسین وەرگرتنی ئەکردین، زۆرم کەیف بە خۆم هات کە لە مەکتەب دانراوم‌و لەناوپاش دەڵێن(مەکتەبلی) یە..ئەو دەرسەتەواوبوو،فیت فیتەنیکیان لێدا، معەلیم چووە دەرەوە، منداڵەکان لەهەللایان داهەرکەسە لە جێی خۆی‌ڕاستبوەو چوونە دەرەوە شەش حەفتێکیان دەوریان گرتم پێیان دەووتم ناوت چی‌یە..؟کوێندەریت ؟ ئیسلامی یان جولەکەیت؟ بەڵام مەحمودی ئامۆزام زوو بە فریام کەیشت پێی گوتن(ئەمە یونسی ئامۆزامە) ئینجا وازیان لە تەشقەلە هێنا، هەندێکیان بوونە برادەرم. بەم جۆرە لە مەکتەبی کۆیە دانرام‌و لەو مەکتەبە پیرۆزەش مامەوە تازستان بەسەر چوو بەهار داهات من لەومودەتە فێری گەلێ شت ببووم. بەڵام ڕۆژێکیان تاریك وڕونی بەیانی دایکە لە خەوی هەڵساندم کەچاوم هەڵهێنادوو ئێستر ڕاوەستابوو بارگەیان لێ‌ئەنا، دایکیشم قۆندەرەو گۆرەیەی لەپێی مەجیدی برام دەکرد چونکە لەمن بچوکتر بوو. ئەوها من‌و دایکم‌و مەجیدی برام‌و حەوێزەی پیاوی مامم بەرێ کەوتین، فاتمی خوشکم لەماڵی مامم بەجێما، ئێمە چووینە ڕانیە. پاش ئیوەڕۆیێکی درەنگ بوو کەگەیشتینە رانیە، دونیا بەهار دەشت‌و کێو ڕەنگاو ڕەنگ سەرما هێشتا بەتەواوی نەشکابوو کۆیە بەنیسبەت هەولێرەوە وەك گوند وابوو کەگەیشتمە ڕانیەکۆیم وەك شارێکی زۆرقەوغام ئەهاتەبەرچاو، دوور بەدووری ڕانیەشارێکی گەورەبوو بەڵام ا نزیکەو/ ئەم دیوارانەی کەئەکەوتە بەرچاوت زۆرکەمیان سواندەدارو سەربار لەسەربرون چوونکە هەمووی کەلاوەبوو ڕانیە لەپاش حەرەکاتی دەربەند ئینگلیزەکان بەبۆمبا وێرانیان کردبووتازەبەتازە تەشکیلاتیان تێدا دەکرد، زۆرترینی ئەهلی ڕانیە عیبارەت بوون لەماڵە پۆلیسو شەبانەو مەئمورینی حکومەت، خەڵقی دێهاتی ئەودەورەش تاك‌و توك بۆخزمەتکاری‌و ڕەنج بەری بەماڵەوەڕویان تێ کردبوو(والحاصل) ڕانیە یەك لەوشوێنانەبوو کەحەرب سەرو گوێلاکی شکاندبوو لەپاش دڵ لەخۆبووردنەوەیەکی زۆر بەخۆهاتبۆوە بەڵام هێشتا برینەکانی چاك نەبوبۆوە هەردەرمان دەکرا. لەهەموو لایەکەوە( خشت) ئەبرا بناغە لێ ئەدرا، دیوارئەکرا، ڕانیە ئاوەدان ئەکرایەوە ژیانی ڕانیەم زۆر لا خۆش بوو چونکە ژیانێکی دێهاتیانە بوو هەتا چاو ئەبڕیی هەر حەوشەی ماڵی خۆتان بوو هەوایێکی پاك‌و ژیانێکی پڕ ئیشاتم هەبوو وەنەبوو کەجێبەجێ کەگەیشتمە ڕانیە دەوامی مەکتەبم تێدا کردبێ بەڵکو لەبەهارەوە تا پایز من تەرکی مەکتەبم کرد، ئەویش لەبەر ئەمە بوو کەهەر دە یان دوانزە ڕۆژ من لەرانیە ساغ مامەوە، لەدواجار (فوجنەتەن- فجاە-) تووشی ئەخۆشی (مەلاریا) هاتم ئیتر مەلاریا سەری تێ‌کردم ڕۆژێك چاك‌و چوار ڕۆژ ئەخۆش بووم لەگەڵ ئەمەش ڕانیەم هەر لا خۆش بوو خاسەتەن زۆر مەفتونی (قولە) بووم، قولە ئەم کانیە بەرینەی ناو ڕۆنەی بەفراوە هەموو مەشاعیری لێ زەوت کردبووم هەر کەچاك ئەبوومەوە

خێرا ئەچوومە سەر قولە لەناو رووبارەکەی مەلەم دەکرد لەبن دارینەکانی راوە چویلەکەم لێ دەکرد عەرزم کردن کەمن زۆر حەز بەتەنهایی دەکەم وە زۆریش ئاسوودە بەخەیالات پەیدا دەکەم ئەمە خاسیەتێکی منداڵیمە، منۆ ئەم خاسیەتەم زۆر چاك لەقولە بەکاردەهێنا سعاتەها لەسەر ئەستیورە زەلامەکانی دەوری قولە دانەنیشتم سەیری شەپۆلە وردیلەکانی قولە دەمێك و سەیری وێنەی (چیای رەش) کەلە ناوەکەوە دیاربوو دەمێکی ترم دەکردو هەزاران چەشنە خەیالاتی کە ئەوساکە دەستەڵاتم بەسەردا نەشکا بەمێشکمدا ئەهات ئەمانە وردە وردە جوانی تەبیعەتیان لەدڵ چەسپاندم چاویان بەرەونەقی خۆیان گەلاوێژ ئەکردم هەرکە مەکتەب کرایەوە بەتەبیعەتی حاڵ چوومە مەکتەب بینای مەکتەب کۆنە بوو، دیسان هەیوانێکی درێژو دالانیك بەسەر حەوشەیدا ئەنوارێ و لەناو دالانەکە حەوشەیدا ئەنوارێ و لەناو دالانەکە دوو هۆدەی ئەم بەرو ئەوبەر بوون کەیەکێکیان سنفی ئەوێتریان هۆدەی (معلم) بوو، عەدەدی قوتابی لەبیست کەس زیاتر نەبوون، هەندێ زۆر گەورەو لەمنیش بچوکتریان تێدا هەبوون لەبەروەی کەهەریەك موعەلیمان هەبوو نەماندەزانی کە کامەمان سنفی یەك و کامەمان سنفی دووین بەیانیان وەکو لەمەکتەبی کۆیە لەحەوشەی مەکتەب ریز نەبووین کە (نەشید) بڵێین یان سەیری پاك و خاوێنی دەست و پەلمان بکەن بەیاری کردن تا موعەلیمە نەفەندی لەژوورەکەی خۆی نەهاتە دەرەوە چونکە هەر لەم ژوورەش ئەنووست یەعنی مەکتەب ماڵی و جێگەی خوێندنیشی بوو بەدەست ئیشارەتی بۆ ئەکردین هەر کەسە لەشوێنی خۆی لەسەر تەختەکانی لەهەیوان ریز کراوە دەگرت موعەلمیش سەر مەشقەیێکی لەسەر تەختەی رەش بۆ ئەنووسینەوەو خۆی ئەچووە ژوورەوە هەندێکیان لەوانە بوون کەقورئانیان لای (مەلا) ختم کردبوو موعەلیم تەکلیفی لێ ئەکردن کەدەرسی قورئان بەوانیتر رەوان بکەن، من یەك لەوانە بووم کەدەرسی قورئانم لای (عبدالقادر) ناوێك رەوان دەکرد. ئەوەل رۆژی کەچوومە مەکتەبی رانیە قوتابی‌یەکان دەورەیان دام یەکێکی سوورەی موو زەردی چوار پەل ئەستوورە چاوشین، بەلامدا هات بەبێ موقەدیمە وتی: چاوت بەو دوو ئەنگوستە دەربهێنم!! زۆر سەیرم پێ هات چونکە چ حاجەتی نەدەکرد ئەم تەکلیفە ناخۆشەم لێ بکات من وامنەزانی گاڵتەم لەگەڵ دەکات، زۆر بەبەساتەت بێ موبالاتی وتم "دەبزانم؟!" هەر هێندەم زانی ئاگرم لەچاو بڵند بوو چونکە هەردوو ئەموستی لەچاوم راکرد من لەگریان و ئەوانیش لەقاقای پێکەنیندا.. نازانم چۆن چاوم بێ زەرەر دەرچوو، پاش دەمێك چاوم هەڵهێنا ئەم ئەتوانی کەتەحەمولی رۆناکی پێ بکەم چوومە ژوورەکەی موعەلیم ئیزنم لێ وەرگرت کەبچمە ماڵەوە، لەپاش ئەو حادیسەیە من و ئەو کوڕە بووینە برادەرێکی زۆر مەتین. ئیعتیمادم زۆر لەسەری دەکرد زۆریشی ئیعتماد لەسەری دەکردم وەلەعەینی وەختا ئینقلابێکیشی فرێدایە ژیانمەوە ئەویش هاویشتمیە ناو جوولانەوەو رانەوەستان، بەتەبیعەتی حاڵ فێری تۆپێنی و قاشەوانی و سێباز لەئەم چەشنە یاریە عەنیفانە بووم لەم رووەوە زۆر قەرزاری (عوسمان)م.. لەرانیە ئەوها رامبوارد تا مامم جەمیل ئەفەندی کەبووە موخەمینی دەغڵ لە (زینۆی) لەسەر ئەسپ کەوت وەفاتی کرد، باوکم ناردی لەشوێنی (کاکەم سەعدی) کەلەهەولێر (موداویمی) مەحکەمەو بەتەعقیبی دەعاوی‌یەوە مەشغوڵ بوو، هاتە رانیەی، کەتەعزیە تەواو بوو، کاکەم سەعدی سەیری ئیستیعدادی کردم زانی کەمن لەرانیە دەفەوتێم تەکلیفی



لەباوکم کرد کەلەگەڵ ئەو بچمە هەولێر بۆ خوێندن. من ئیستعدادێکی کافیم هەبوو لەو مودەتەی کەلەرانیە بووم بەواسیتەی مەراقی شەخسیم زۆر محاوەلەی فێربوونم دەکرد هەر شتێکی نووسراوم بدیبایە ئەمخوێندەوەو ئەمتوانی کەبەکوردی زۆر چاك بنووسم باوکم بەرامبەر ئەم تەکلیفە مومانەعەتی نیشان نەدا..

هاوینی سالی ١٩٣٠ بوو کەمانگ هەلات لەخەویان هەڵساندم سواری ئیسترێیکان کردم لەگەڵ کاکەم سەعدی رێگەی کۆیمان گرت کەگەیشتینە کۆیە هەموو بەجارێك بەپیرمانەوە هاتن منیان وەرگرت، ئیتر دوو رۆژ لەکۆیە ماینەوە، سواری ئۆتۆمبێل بووین هاتینە هەولێر یەکەم جاربوو لەحەیاتی خۆم کەسواری ئۆتۆمۆبێل بووم، کەچی هەروەکو ئەیان ووت: ئینسان لەناو ئۆتۆمۆبێل سەری بەگێژەوە دێتو ئەرشێتەوە، وانەبوو. زۆرم لا خۆش بوو پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ بوو کەگەیشتینە هەولێر لەمالی پوورم دابەزین چونکە لەم سەفەرە پووریشمان لەگەڵ گەڕایەوە، هاتبووە کۆیە بەموناسەبەتی تەعزیەی مامم، شەو لەمالی پوورم نەنووستم بەڵکو لەگەڵ کاکەم سەعدی هاتینە خوارەوە لەمالی خۆمان نووستم خاووخێزانی کاکەم سەعدی بەموناسەبەتی سەردان هەموو چووبوونە مالی ئاسەفی برام لەمەخمور لەبەر ئەمە کەبۆ رۆژی دوایی هات ئوتومبێلمان گرت چووینە مەخمور، مەخموور لەرانیە گەورەترو لەکۆیە بچووکتربوو بەلام وەکو رانیە فێنكو ئاوی ساردی نەبوو، بەڵکو شارێکی وشكو ئاوی تال، بێجگە لەئادی چ شوێنی وای لێ نەبوو کەدرەختی تێدا بێت، لەمەخمور هێندە نەمامەوە بەڵکو لەگەڵ مالی کاکەم سەعدی هاتینەوە هەولێر، هەولێرم لا غەریب نەبوو، بەلام دیسان گۆڕابوو بەردەمی قەلاتی هەولێر کەجێگەی تۆپی رەمەزان و هەڵخستنی جۆلانەو چەرخ و فەلەکی جەژنان بوو، ببووە ڕێزە دوکانێکی بلند بلندو سەرەکەی کرابوە ئوتێل و چایەخانە، مەکتەبی جاران و پۆستەخانە یەکێکیان بووە گەراجی ئۆتۆمبێل و ئەوێتریان بووە چایخانە، بەلام خانەقا هەروەکو جاران بوو.

کەگەڕامەوە هەولێر قاتێك ئەلبیسەی سەترەو پانتەلۆنیان بۆ دروست کردم ئەمە یەکەم جارم بوو کەئەم چەشنە ئەلبیسانە لەبەر بکەم.

ئەگەر لەهەولێر لەلایەن چ شتێکەوە ئوقسانیم نەبوو بەڵکو وەکو مەلێکی فێری دەشت بووبێ لەناو قەفەس دابنرێ بەم جۆرە دلم لێی ئەگوشرا خاسەتەن قیرە قیری براژنم کەجاران خالۆژنم بوو کاکەم سەعدی مارەی کردبۆوە، دوو کچەکەی خالمی بەخێو کرد، یەکێیانی دایە (ئاسەف) ئەوێتریانی لەحەمیدی برام مارەکرد کەلەسەر هەموو شتێك شەڕێکی دەکرد من رقم لەمالەکە ئەبۆوە، یەکەم ئیشتیاقی رانیە دووەم بێزاربون لەهەولێر منی هاویشتە سەر ئەمە تەکلیف لەکاکەم سەعدی بکەم کەبمنێرێتەوە رانیە، بەلام کاکەم سەعدی دلی دامەوە وە لێی پرسیم بۆچی حەز ئەکەیت بچیەوە رانیە؟ پێم ووت: کەلەهەولێر بێزار بووم

لەسەر ئەمە ئۆتۆمبێلی بۆ گرتم و ناردمیەوە مەخمور، وە وتی: بڕۆ مەخمور کەمەکتەب کرایەوە بۆ ئاسەف دەنووسم دەتنێرێتەوە هەولێر، تۆ نەهاتوی بۆ کەیف هاتوی بۆ خوێندن پێویستە بخوێنی، بەم جۆرە چوومەوە مەخمور (الحمدلله) لەقرەقری شەڕو شۆڕی مالی کاکەم سەعدی لەهەولێر رزگار بووم، لەمەخمور بەرۆژ ئەچوومە دائیرەی تەحریرات کەئاسەفی تێدا مودیر بوو سەیری ماکینەی نووسینم دەکرد کەچۆنی پێ دەنووسن لەحەیاتما تووشی شتی هێندە سەیر نەهاتبووم کەچاك سەرنجم دایە دەستیان وام تەسەور کرد منیش ئەتوانم پێی بنووسم کەکاتبەکە هەڵستا چووم لەشوێنی دانیشتم حروفاتی ناوی خۆم ئەدۆزیەوە بەئەموست لێم ئەدا ئەویش لەسەر کاغەزی ئەنەقشاند کاناورپم دایەوە ئاسەفم لەپشتەوە راوەستابوو زۆر ترسام کەشتێکی خراپم کردبێ بەلام کەدیم پێدەکەنێ دلم داکەوت ئینجا وتم "یا" و

واوم نووسیوە هەرچەندێکی لە (نون) ئەدەم هەر (ح) دەنووسێ لەسەر ئەمە ئاسەف دەرسێکی (تایپ رایتەری) دامێ لەئەسرارەکانی گەیشتم سێ رۆژی پێ ئەچوو کاغەزێکی دوورو درێژم بۆ باوکم تەقدیم کرد لەسەر ئەمە ئاسەف سەعاتێکی زێڕو لیرەیێکی (موکافاتی) دامێ، بەلام لەپاش دوو رۆژ سەعاتەکەی لێ سەندمەوە بەحوجەتی ئەمەی یەکێکی چاترم بۆ لەموسڵ جەلب دەکا وە لیرەکەشم لای براژنم دانا کەگەڕامەوە هەولێر بمداتەوە، بەلام کەگەڕامەوە هەولێر ئەسەعاتم پێ بوو ئەلیرە.. سەعات هێشتا نەگەشتبووە جێ لیرەش بەقەرز خەرج کرابوو من لەمەخمور هەروەکو چاوم کرایەوەو فێری بەماکینە نووسین بووم هەروەها دووشت منیان زۆر بەتین بۆ دوو شتی زۆر تازە رادەکێشا یەکێکیان موجادەلەیێکی کاکە ئاسەف بوو کەلەبابەت ئیشتمان پەروەریەوە لەگەلی کردم ئەویش بەم سورەتە بوو:-

پاش نیوەڕۆ بوو کەلەهەیوان دانیشتبووین چایەمان دەخواردەوە کەئاسەف لێی پرسیم: یونس تۆ چیت؟ جوابم دایەوە: "من یونسم چ بم؟" ئینسانم وتی مرازم ئەمە نیە یەعنی تۆ خۆت بەکورد یان تورك یان؟ ئینگلیز دائەنێیت یان ئا؟ پاش گفتوگۆیەکی زۆر کەهیچی لێ تێنەگەیشتم بەلام یەك شتی لەعەقیدەو ئیدیعا گۆڕیم کەئەویش لێیان پرسیم تۆ چیت بلێم من کوردم.. دوو سێ سەعات لەژێر تەئسیری ئەم ووتانەدا مامەوە لەئیهایەتدا قەرارم دا کەرقم لەهەموو ببێتەوە ئەما ئەم قەرارە زۆر سەری ئەگرت چونکە (بەهیە) کچی خالم وتی با غەرامە فۆن لێ بدەین، یەدوای کەوتم کەچووینە سەر (غەرامە فۆنەکە) دەفتەرێکی خۆم لەسەر سندووقی غەرامەفۆنەکە داندرابوو، من هەر هەڵمگرت و فڕێمدایە سەر ئەرز، بەهیە خێرا هەڵی گرتەوە وتی ئەمە رەسمی مەلیك فەیسەلە سەیدە کوڕی حەزرەتی حەسەن فڕێ مەدەرە سەر ئەرز چاوت کوێر ئەبێ من خۆشم دەوێت، ئیتر رەسمەکەی خێرا خێرا ماچ دەکرد ئیترمن ئەم رەسم ماچ کردنەو ئەم وتارانەی بەهیە ووتارەکانی ئاسەفی سەراپا لەبیربردمەوەو قودسیەتێك و پیرۆزیکی ئەم رەسمەم وا کەوتە دڵ کە خواخوام بوو بەهیە لە ماچ کردنی رەسمەکە ببێتەوە منیش ماچێکی بکەم، فیعلەن دەفتەرەکەم لەدەست وەرگرت و بەخشوعەوە ماچم کردو لەسەرمێزەکە دامنا..

ئەمە دەرسی یەکەمی ئیشتمان پەروەری بوو کە وەرم گرت و بەم چەشنەش لە دلمدا جێگیر نەبوو، بەلام لەپاش ئەم حادیسەیەش هەر وەکو شتێکی تازەم دۆزیبێتەوە شعورم بە خۆم ەکرد دە من یونسەکەی جاران نیم من. ئیم کوردم.وە وام حەز دەکرد دە باز بدە و بەکۆلاناندا ڕاکەم و هاواربکەم: (**من کوردم، من کوردم..**) ئەم ئینقیلابە غرورێك و غیرەتێکی دامێ کە ئازانم وەسفی بکەم. من لە رانیە بە شانی گەلێ کەس تفەنگم دیبوو، هەتا باوکم تفەنگیشی هەبوو بەلام دایکم چونکە زۆر ترسنۆك بوو قەد نەیدەهێشت کە نزدیکی بکەوم ئەیقیژاند ئەیووت:(دەستی لێمەدە ئەتەقێ) لەبەر ئەمە وام چووبووە مێشك کە تفەنگ دەستی لێ بدرێت ئەتەقێ ئەمدەوێرانزدیکی هیچ چەشنە سیلاحێك بکەوم. لە مەخمور ئاسەف تفەنگی ڕاو ـ ساچمە ـ و تفەنگی شەڕی هەبوو بەلام من تەبیعی هەر وەکو دایکم بردبویە مێشکمەوە کە نابێ نزدیکی تفەنگ بکەوم. نزیکی ئەدەکەوتم شەوێکیان ئاسەف دانیشتبوو، لە پێش چاوی من پاکەتێك فیشەکی هاویشتە ناو تفەنگەکەیەوە پاشان لولەی لە من کردو ووتی (بتکوژم؟) منیش ترسام خۆم هاویشتە پەنای لانکی ئەسرینەوە لەسەر ئەمە ئاسەف زۆر پێکەنی، منی بانگ کردە لای خۆی ئیستیعمال کردنی تفەنگی فێر کردم و تفەنگەکەی دامە دەست تەکلیفی لێ کردم کە فیشەکی تێبخەم وفیشەکی لێبهێنمە دەردوە هەر عەینی شەو ئیستیعمال کردنی دەمانچەشی فێرکردم، بەم چەشنە ڕۆحێکی دامێ کە لە سیلاح ئەترسم بەڵکو زۆر حەزم دەکرد منیش وەکو ئەو تفەنگم هەبێ و هەر وەکو خۆی پێی ووتبووم(حەزم دەکرد کەسەعی زۆر بکەم بە یەکەمین لە مەکتەب دەربچم تفەنگم بۆ بکرێت)

ئیتر یەکەم خۆناسینم کە کوڕێم‌ودووەم ئیستیعمالی سیلاح فێربوونم ئەم دوو شتە بە تەواوی ئینقیلابێکی زۆر بە قوەتی خستە ماخۆلیاو ئایدیالمەوە. ئەو مودەتەی‌کەلە مەخمور مامەوە زۆرترین وەقتم بە مەکینەی نووسین‌وغرامەفۆن لێدان‌و هەڵپچڕینی تفەنگ ڕائەبوارد کەشەوانیش لەسەر جێگا ڕادەکشام خەیاڵم لە شەڕەتفەنگ‌و سواری دەکردەوە ئەم خەیاڵانە ئەیا سەیەبێکی بۆ ئیجاد بکەم‌و هەر دەم سەبەبەکەش ئەمە بوو کەکوردو...... بەشەڕبێن لەسەرچی؟ نازانم..

کاغەزی کاکەسەعدی هات ئەمەی تێدابوو کەوا مەکتەب بەمزوانە ئەکرێتەوە پێویستەبگەڕێمەوە هەولێر، فیعلەن پاش دوو ڕۆژ من لەهەولێربووم دیسان هاتمەوەنێو شەڕوهەڵای براو براژنم بەڵام ئەمجارە بەهیەشم لەگەڵ هەناردرایەوە، بەهیە هەرچەندە بەعوومر سێسال لە من گەورەتر بوو بەڵام خۆی لەتەرازوی مندا ئەکێشا زۆرمان یەکتر خۆشدەویست‌و زۆریشمان ڕق لە یەکتر ئەبۆوە لە سەر هیچ لەگەڵم بەشەڕدەهات زۆر خراپی لێ ئەدام و زۆر زووش ئاشتی دەکردمەوە دەستی لە مل دەکردم‌و ماچی دەکردم ، کچێکی زۆر خەیاڵی بوو بەڵام خەیاڵەکەی هەر دەم لە تەسەورکردنی شتی ئاجائیز بەکار دەهێنا مەسەلا لەسەرووتاری خۆی زۆرکەسی دیوە کە دۆستیان هەبووە فلان‌و فلان حەزیان لەیەکتر کردووە، فلان پ̈ سمر بۆ فلان ناردووەو ئیتر لەم لایەنەوە بەهیە تەقریبەن کەسی بێ‌دۆ ست نەهە ێشتبووەوە. براژنم خەیاتی دەکرد شاگردێکی هەبوو ناوی(نەعیمە) بوو کچی‌پیاوێکی شەریەت فرۆشی فەقیربوو، بەڵام نەعیمەکچێکی دڵارام‌و جوان‌و زۆر وریاو دەمبە پێکەنین‌بوو لەخۆم یەدووسێ ساڵ بچوکتربوو بەڵام زۆر لەمن‌و بەهیە عاقڵ تربوو زووزوو تێک دەچووین بەڵام هێشتا ووتارێکی وای‌نەوتوە کەدڵم لێی شکابێ، زۆرجاران کەمن‌و بەهیە پێکەوە بەشەڕ دەهاتین نەعیمە شاهێدی بۆ ئەدام کەخەتای من ئەبووە کەکاکەم سەعدی وەیا براژنم دڵیان دەشکاندم نەعیمە لەگەڵ من دائەنیشت غەمی لەگەڵ دەخواردم‌و لەگەڵم ئەگریا ئەمە خۆشەویستی نەعیمەی ڕۆژ بەڕۆژ لەدڵ زیادکردم، زۆرم لاخۆش بوو لەدەمانی عاجزیمدا نەعیمە خۆیم بەسەرشانیدا بدا وەکو جاران سەرم بخورێنی‌و بەدەنگێکی بەگریانەوە پێم بڵێ "بیغلە ما قایدی یوختی" ئێستا وا پاش پانزە ساڵ ئەم موزەکەراتە ئەنووسمەوە هەست بەئە دەکەم کەقوەتێکی خاس، قوەتێک کەهەمووی وەفاو خۆشەویستی‌و برایەتی‌یە بەرەو نەعیمە رام ئەکێشێ، ئەگەر ئێستا لام بایە دەستەکانیم ماچ دەکردو ئەمەم تێ‌ئەگەیاند کەمن ئەوساکە چەند موحتاجی ئەم (عێجزمەبەی) ئەوبووم

مەکتەب پاشی مانگێک ئەکرایەوە نازانم بۆچی کاکم سەعدی منی هێنایەوە هەولێر، لەگەڵ ئەمەش ئەم ئیحتیجاجەم بەکەس ئەدەووت، لەسەر تەوسیەی براژنم کاکەم سەعدی منی لای (مەلا برایم) ناوێك لەخانەقای شێخ جەمیل ئەفەندی لەبەر خوێندن دانا سوختەخانەم لا خۆش بوو چونکە زۆر کەسی وەکو منی تێدابوو، هەموومان بەهاوین سوختەو بەزستان مەکتبەلی بووین مەلا برایم پیاوێکی باریکەلەی ڕەنگ گەنجی دەم‌و چاو مەیلەو درێژ خڕوکاوی بوو جلکی پاك‌و خاوێنی لەبەر دەکرد، چاوەکانی ڕەش‌و مەیلەو بچووك بوو زۆر قەشمەرجارو دەم بەپێکەنین بوو، لەگەڵ ئەمەشا لەگەڵ سوختەکانی زۆر توورەو تەنگاو، لەسەر ئەدنا شت (فەلاقەی) ئەکردین، بەڵام معامەلەیەکی تایبەتی لەگەڵ من دەکرد چونکە برای سەعدی ئەفەندی بووم وەسەعدی ئەفەندیش دۆستی مەلای موحتەرەم بوو! پاش مانگێك مەکتەب کرایەوە مەدرەسەی ئەوەڵ‌یەی کەناوی (شعبە)بوو کەبەکوردی تەدریسی تێدا دەکرا ئەم شەهادەیەی کەلەرانیە وەرم گرتبوو وەلەمەخمور بەهیە لێی دراندبووم‌و ئاسەف بەسەمغ بۆی پێك هێنابوومەوە لەگەڵ خۆم برد بەبێ ئەمەی کەسم لەگەڵ بێت چوومە مەکتەب، پرسیم هۆدەی مودیر ئەفەندی لەکوێ‌یە؟ فەراشێك نیشانی دام چوومە ژوورەوە ئەفەندی‌یەکی گەنج بەسام دانیشتبوو، بەسەر ئیشارەتی کردم کەچیم دەوێت! چوومە پێشەوە بەدەست سەلامێکم گردو شەهادەکەم داین؛ خوێندیەوە وتی تۆ یونسی برای ئاسەفی؟ ووتم: "بەڵێ" وتی ئیمڕۆ مەکتەب نیە سبەی نا دووەی ڕۆژی شەمو وەرەوە تۆمان لەسنفی سێ قەید کرد، وتم "باشە" سەلامێکم کردو چوومە ماڵ بەدەنگێکی بەرز وتم "چیتر ناچمە سوختەخانە" ئێستا چوومە مەکتەب خۆم قەید کرد، براژنم وتی: "چاکت کرد"..

ڕۆژی شەموو هات زۆر بەنیشاتەوە چوومە مەکتەب لەحەوشەکە ڕیزیان کردین ناویان خوێندینەوە لەپاشان سنف سنف هەر سنفە چووینە ژوورێکی تایبەتی‌یەوە ئەتوانم بڵێم زۆرترینی سنفی سێ‌یەم لەخۆم بەعومر زۆر گەورەتر بوون، غەریب بووم لەناویاندا هیچ کامیانم نەدەناسی، غەیرەز ئەمەی کەلە تەکمەوە دانیشتبوو ناوی خۆمان بەیەکتر وت ناوی ئیسماعیل حاجی کەریم بوو، ئیسماعیل یەکەم کەس بوو لەمەکتەب ناویم زانی‌و بووینە برادەری یەکتری بەرەبەرە ڕۆژ بەڕۆژ هەواڵەکانم ناسی بەڵکو بەوردی سەیری هەڵستان‌و دانیشتنیم ئەکردن ئەمە (حەمید کەریم)ە کوڕێکی ڕەنگ زەردی جڤارەکێشی سەروریشدارە، لەهەڵستان‌و دانیشتندا وابەدیار دەکەوێ کەئەخلاقی زۆر چاك نیە، ئەمە (کەریم شەریف)ە کوڕێکی کورتەباڵای دەم‌و چاوپان لووت باریکی چەناگە هەڵگەڕاوەیە ڕەنگێکی گەنمی مەیلەو ئەسمەری هەیە زۆر ڕەفیقی (حەمید کەریمە) زۆر جاران پێکەوە حەیاتی شەوی رابردوویان بۆ یەکتر ئەگێڕنەوە، کەچۆن قوماریان کردووەو شەو لەباغی سەعیدئاغا ڕایانبواردووە، ئەمە (نەجمەدین)ە چوارشانەی ورگ زەلامی ڕەنگ زەردی ددان شاشی چڵکنی دوو دان زێڕە، کەهەردەم جغارە پێ ئەکات کەوەختی ئیستراحەت هات لەسەر جێگاکەی خۆی نابزوێت بەڵکو مێزەکەی ئەکاتە تەپڵی بەستە ئەڵێت‌و مل بائەدا: (نەجم‌الدین) دەنگی زۆر خۆش بوو بەڵام هەر بەستەی تورکی دەزانی ئەم سێ کەسە بەتایبەتی هەموو لایەك خۆمان لێ ئەپاراست زۆر تخونیان نەدەکەوتین، بەڵام لەگەڵیشیان بەشەڕ نەدەهاتین چونکە لەئێمە گەورەتربوون ئەوانیش بەچاوێکی بچووکەوە سەیریان دەکردین بەڵام بەرەکەتدا هیچیان نەدەزانی لەلای هەینەتی موعەلمین، ناویان (گای ناو گۆلکان) بوو، ئەمە حیسام نافیع ئاغایە، کوڕێکی چوار شانەی سەرگەورەی باڵابەرزە، لێو ئەستور ڕەنگ زەردو چاوڕەش جلکی زۆر جوانی لەبەرئەکرد، بەڵام نازیرەکترین کەس بوو، حاجی کەریم ئەفەندی موعەلیم ناوی لێنابوو "حەپە لۆری مێش خۆر" ژیانی شەخسیم لەمەکتەبدا لەوانە ئەبوو کەدیار بم بەڵام ئیهمالیش نەدەکرام لەهەموو دەرسەکان وەك باش نەبووم لەهەندێکیان وەکو (تەئریخ‌و جوغرافیاو دین‌و ئەشیا( یەکەم بووم، لەحیساب متەوەسیت، لەعەرەبی نەزان بووم، زۆر رقم لەریازە دەبووەوە هێندەی پێ نەچوو کەخاوەن خانووەکەی ئێمە تێدابووین ئیسراری کرد کەلێی دەربچین کاکەم سەعدی چوو لەقەڵات لەتەك ماڵی یوسف ئەفەندی قازی خانوێکی یەا، چاوەیی گرت ئەگەر چی ناخۆشی‌و تاریکی‌و کۆنی خانوەکە زیکرەیاتێکی کۆنی براژنمی هێنابووە جۆشش‌و دەم‌و سەعات بەدەم شەڕەوە باسی خۆشی خانووی خۆیانی دەکرد منەتێکی دوورو درێژی بەسەر خوادا دەکرد کەبەم حاڵە ڕازیەو هەتا بەهیەش چونکە دەستە خوشکەکانی لەدەست چوو بوو چار بەچار بەدەنگێکی ناخۆشی زۆر لەنازکی‌و حەنانەوە دوور ئەگریا، ئەمە بەتەبیعەتی حاڵ سەبەبێکی زۆر مولائیم بوو کەئاگری فیتنە لەماڵی ئێمە ئەکوژێتەوە بەڵام کەری خۆم بەستابووەوە هەر لەمەکتەب دەهاتمەوە لەگەڵ جەلیلی یوسف ئەفەندی کەپێکەوە لەمەکتەبیش لەسنفێکا بووین بەیاری تا ئێوارەمان ڕادەبوارد، بەواسیتەی جەلیلەوە زۆر کەسی تریشم ناسی وەکو (جەلال قادر) کەبرازای حاجی موستەفای توتنچی بوو، لەمەکتەبی ئیسرائیلیەکان لەسنفی سێ‌یەم ئەیخوێند، جەلال کوڕێکی سپیلکەی چاو گەورەی دەم بەپێکەنین بوو، کوردی زۆر چاك نەدەزانی منیش

تورکیم چاك نەدەزانی، بەڵام بەراستیش یەکترمان خۆش دەویست پاشان (موستەفا موحەمەد)م ناسی کەکوڕی موحەمەدی تەها بوو لەسنفی پێنجەم ئەیخوێند، موستەفا کوڕێکی کورتە باڵا سەر گەورە چاو زیندووی ڕەنگ گەنجی بوو، زۆر بەتین بوو لەبەتینی قەدرمان ئەگرت ئەم تیپە هەر بەیەکەوە ئەگەڕاین.

لەم ئانانەدا بوو کەکاکەم ئاسەف ماڵو منداڵی هەناردەوە هەولێر چونکە لەوەزیفە دەستیان لەئیش کێشابووە، تەبیعی ئەم خانوەی کەتێیدا بووین زۆر بچووك بوو لەبەر ئەمە خانوێکی ترمان لەخوارەوە دیتەوە کەدوو هۆدەبوو یەکێکیان لەسەرەوە ئەوی‌تریان لەخوارەوە بەڵام ئەمەندە کۆن بوو کەتەسەور نەدەکرا چۆن ڕاوەستاوە لێرە شتێکی خۆشم بەیاد کەوتەوە ئەویش سێ چوار ڕۆژ بوو براو براژنم شەرە دندوکیان بوو بەڵام (مع الاسف) هەموو ڕۆژێ کاکەم سەعدی کەدەهاتەوە لەدەرگەوە براژنم بەورگی زلی‌یەوە کڵاوەکەی خوار دەکردەوە یەکەم توانجی تێدەگرت‌و ئەدەگرت کاکەم بەدەم‌و چاوە باریك‌و لۆچ لۆچاویەوە پێدەکەنی. چەند روپیەکی بۆ دەرئەهێنا هەروەکو لەم پارەیە (مفاوەزاتی) سولح بکاتەوە ئیستعدادی نیشان ئەدا ئەریش پارەکەی لەدەستی بانەداو ئیورووپیەی ئەدایەوە دەست، ڕۆژێکیان خۆی‌و بەختی کەچ پارەی پەیدا نەکردبوو تەبیعی دبلۆماتیکیاتی سەلەفەن بێ قیمەت بوو، شەڕ هەڵگیرسا خێرا کاکەم سەعدی ڕایکردە دەرەوە شەو درەنگ هاتەوە من‌و ئەوان لەهۆدەی خوارەوە دەنووستین شەو کەهاتەوە یەکتریان ئەدواند بەیانی لەو سەری من لەهاوار هاوارێك ڕاپەڕیم کەسەیرم کرد.. براژنم کاکەمی لەژێر خۆی ناوە پێی دەڵێ: وەڵڵا ئەمجارە لەبەر دەستم ڕزگار نابی خۆلە ڕقی تۆ شەقم برد!! کاکەشم هاواری دەکرد کچێ ڕاوەستە شتێکم دۆزیەوە نازانم چی‌یە؟ ئیتر لەم مشت‌و مڕە ڕاست بوومەوە لەجێی خۆمەوە ئەمزریقاند ئەمووت (براژن بەرهەڵای ئەکەی ڕاست بێتەوە ئەتکوژێ!!) بەکاکەشم ئەووت: (ئەگەر ئازای خۆت لەبەر دەستی بەرەڵا دەکەی!!) مرازم ئەمەبوو کەلەم حاڵە دەوام بکەن، چونکە زۆرم لا سەیر بوو کە ژن پیاو بهاوێتە ژێر خۆی) بەڵام بە تەوەسولاتی کاکەم سەعدی براژنم لەسەر سنگی لاکەوت کەهەڵستا دەستی درێژ کردە مێزەکەی ژوور سەریانەوە کەهەمانەی زەخیرەی لەسەر ڕێزکرابوو شانەیێکی بچووکی سەرانی هێنا دەرەوە وتی: ئا ئەم شانەیە هی کێ‌یە؟ براژنم وتی ئەمە شانەی بەهیەیە سێ چوار ڕۆژە هەراسانی کردووم بەخوای چاك بوو دۆزرایەوە بەم گوێرەیە سەد بارە ئاشتی بەشەرمەزاری‌و تەرەدودەوە لەدەرگا هاتە ژوورەوەو شەر ئەمانەتەن خۆی لەپشت دەرگا شاردەوە، ئەوێ ڕۆژێ یەکەم ئیشم لەمەکتەب ئەمەبوو کەئەم حادیسەیەم بۆ بارکم نووسی باوکیشم بەتەعلیقەوە کەهەمووی هەزەلیات بوو بۆ کاکەم سەعدی ناردەوە لەسەر ئەمە کاکەم سەعدی زللەیێکی لەبناگوێ دام‌و سوێندیشی خوارد کەلەنێو پاش بەزللە قسە لەگەڵ هەموو کەسێك بکات، براژنم وتی: لەگەڵ منیش؟ وتی کێ لەگەڵ تۆیەتی!!



کاکەم ئاسەف لەبەغدا گەڕایەوە هەر لەعەینی گەڕەك خانووێکی زۆر خۆشی گرت ئەشیامان گواستەوە ناوی ژیانێکی تازە کەوتە ماڵی ئێمە، بەڵام وا ئەبێ ئەم ژیانە چ تەئسیرێکی مەحسوسی کردبێتە سەر شەڕو ناکۆکی بەینی کاکەم سەعدی‌و براژنم بەڵکو ئەم ناکۆکی‌یە هەرمابوو بەڵام هیچ کام لا بەراستیان نەبوو "ئەعیمە" چیتر شاگردیەتی براژنمی نەکرد، ڕۆیشتنی ئەعیمە بەتاڵی‌یەکی زۆری لەبەرچاوی مندا بەجێ هێشت بەتاڵی‌یەکەی هەر لەبەر ئەمە ئەبوو کەزۆری خۆش دەویستم بەڵکو شتومەك کڕین لەبازاڕ لەسەر شانی ئەعیمە بوو کەوتە سەر شانی من ئەمەم زۆر پێ ناخۆش بوو بەڵام مەجبوریش بووم بیکەم، کەم ڕۆژ وابوو دووجار گۆشتم پێدا ئەنێرنەوە بازاڕ ئاخری تووڕە ئەبووم چیتر بەقسەم نەدەکردن لەسەر ئەمە شکایەتیان لێ دەکردم کاکەم سەعدی بەشکایەتی وان وەك بورکانێك بەسەر سەری مندا ئەتەقی بەڵام زۆر جاران ئاسەف موحافەزەی دەکردم‌و بەنەرمی دڵی ئەدامەوە کەکاکە سەعدی برای گەورەیە ئەبێ لەقسەکانی عاجز ئەبم من ئەمزانی کە کاکەم سەعدی لەسەر ئەمەی کەزوو لێم تووڕە ئەبوو زۆریشی خۆش دەویم ئەم لەئاسەف چاکتر سەیری ئەواقیسی دەکردم، بەڵام من لەدڵدا ئاسەفم لەئەو زیاتر خۆش دەویست‌و زیاتر مەیالی ئاسەف بووم.

لەم تەئریخە ئاسەف بێ ئیش بوو، زوو زوو سەفەری بەغدای دەکرد بەواسیتەی برادەرایەتی کەلەبەغدا پەیدای کردبوو، توانی تەئسیرێکی وا بکات کەئیجازە (محاماتی شەرعیە) بۆ کاکەم سەعدی ئیحراز بکات، بەمە کاکەم سەعدی بوو بە (محامی) ئەو ڕۆژەی کەئیجازەی محاماتی بۆ هات شەڕێکی زۆر گەورە لەبەینی ئەم‌و ژنەکەی قەوما. شەڕەکەش لەسەر ئەمەبوو کەنابێ براژنم خەیاتەیی بکات ئەویش ڕازی ئەدەبوو، ئاخیر ، موەفەق بوو بەشەڕو قیرەقیڕ پێی سه'ا''ند، ئەمە وابزانم یەکەم (ئینتیسار)بوو کەلەحەیاتی ژن‌و مێردایەتی ئەودا ڕوویدابوو.

ئاسەف برادەرێکی زۆری ئەهاتنە لا زۆر جاران منیان دەرئەکردە دەرەوە دەرگایان لەسەر خۆ پێوە ئەدا، ئەمئەزانی بۆچی؟ شەوێکیان (سەعدی جەلالی) موعەلیم هاتە لای ئاسەف سەعدی جەلال گەنجێکی ئەسمەری قەدە باڵای خوێن شیرین چاوەکانی ڕەش‌و گەورە جلکی زۆر جوان‌و ڕێك‌و پێکی لەبەر دەکرد،لەپاش ئەمەی کەدانیشت منیان دەرکردە دەرەوە هێندەی پێ نەچوو ئاسەف منی بانگ کرد چوومە لایان سەعدی جەلال پێی وتم (یونس) تۆ لەمەکتەب ڕەفیق‌و برادەرت زۆرە؟ وتم بەڵێ وتی شتێکت پێ دەڵێم ئەگەر بەقسەم بکەی پاسکیلت بۆ دەکرم وتم بەبێ پاسکیل بەقسەت دەکەم، هەندێك پێکەنی‌و وتی: ئافەرین، تۆ کوردیت؟ وتم بەڵێ کوردم، وتی گوێگرە هەموو ڕۆژێ لەمەکتەب لەگەڵ برادەرەکانت یەکتر بگرن بەخۆتان بڵێن "بەچە شێر"وە ئەوەی وتی من کورد نیم لێی بدەن" وتم "باشە".

بەیانی لەمەکتەب بایی سێ ئانە قەزوانی سوێرم کڕی، بەسەر سێ چوار برادەرم دابەش کردو پێم وتن: "ئێمە کوردین بەچە شێرین با بگەڕێین ئەوی نەبێتە بەچەشێر بەچە ڕێوی‌یە لێی بدەین" ئەم فیکرەیان زۆر لا خۆش بوو، گەڕاین سێ چوار کەسی تریشمان بەزەبرەی مشتەکۆڵەو دەنکە قەزوان، کردە (بەچە شێر) هەفتەیێکی پێ نەچوو کەمەکتەب زۆرتریانی ببونە بەچەشێر، هەر فیتنیقەی ئیستراحەتی لێ ئەداو ئەنەدا بەجارێك لەهەموو لایێك هەڵڵا بڵند ئەبوو ئەیان ووت "بەچە شێرین، بەچەشێرین"و راوی بەچەڕێوی‌یەکانیان دەهێنا، شکایەت زۆر بوو ئیدارەی مەکتەب پێی زانی، ڕۆژێکیان مودیر کۆی کردینەوە وتی:

"لەمەو پاش ئەوی بڵێ بەچە شێرم سەری دەشکێنم، ئەوی بڵێ بەچە ڕێویم لاقی دەشکێنم، هەمووتان بران کوڕی پیاوانن"، (کوردن) واز لەم شەڕو هەللایە بهێنن، ئەوی وازی لێ نەهێنێ لەمەکتەب دەری دەکەم. بەمە ئیدارەی مەکتەب ئیستراحەتی کرد قەزوان فرۆشیش چیتر قەزوانی نەهێنایە مەکتەب. ئەو مناوەرەیەی سەعدی جەلال بەم دوو کەلیمە قسەیە نیهایەتی هات بەڵام لەپاش شەش ساڵ تەفسیری خۆی بەخشی، پاش مانگێك لەپاش حادیسەی مەکتەب شەوێکی زۆر سەرمای بەهار کاکە ئاسەفم متی بانگ کردە ژوورەکەی خۆی‌و پیاوێکی تری لابوو کەواییێکی شۆرەیان لەبەرکردم‌و جامانی‌یەکیان لەسەرنام ئاسەف وتی: "لەگەڵ کاکە ڕەشید بڕۆ" چیت پێ بڵێ وابکە منیش وتم "باشە" باران زۆر بەتاو ئەباری بایکی بەقوەتی ئەهات تاریك بوو چاو چاوی نەئەدیت، من‌و کاك ڕەشید ڕۆیشتین تا چووینە دەرەوەی شار، لەوێندەر پیاوێکی تر ئینتیزاری دەکردین، هەرسێکمان ڕۆیشتین لەبەر ڕوناکی بلاچەی بروسکە بەرخۆمان ئەدیت خۆمان لەکێل‌و بەرد ئەپاراست لەرێگا رەشید پێی وتم: "ئێستا ئەچین بۆ ماڵی زابتی ئیستخبارات" شتێکت ئەدەمێ تۆ ئەچی لەدەرگا ئەدەیت خزمەتکارێکی هیندی دێتە دەرەوە شتەکەی بدەیێ‌و بڵێ ئەمە بۆ فەخامەتی مەندوبی سامی‌یە گەر وتی ڕاوەستە، تۆ کێیت؟ ناوی خۆتی پێ مەڵێ وە ڕامەوەستە گەر پەلاماری دایت بتگرێ ڕاکەو بڵێ: ئاگر. ئاگر. باشە" وتم باشە. تێگەیشتم. بەپشت قشلە سوڕاینەوە چووینە بەر تێلخانە، لەوێ سوڕاینەوە، ڕیزە خانویەك هەبوو ڕەشید وتی: "دەرگای دووەم هەوە، هاتی ئەم زەرفەبیە" زەرفێکی درێژی دامێ زەرفەکەم وەرگرت‌و چووم لەدەرگام دا پیاوێك وتی: "منو های؟" وتم: ئەنا.. هات دەرگای لێ کردمەوە! بەلەهجەیێکی هیندیانی وتی شتریت؟ زەرفەکەم دایێ وتم: فەخامەتی مەندوبی سامی" سەیرێکی دوورو درێژی کردم بەددانە سپی‌یەکانی پێم پێکەنی وتی" زین.. زین" ئیتر زەرفەکەی وەرگرت‌و من گەڕامەوە، ڕەشیدو کابرایەکەی تر لەسەری کۆڵانەکە لەپەنا دیوارێکا ڕاوەستابوون، سەیرم کرد هەردووکیان دەمانچەی رووتیان بەدەستەوە بوو وتم "دامێ" ڕەشید وتی ڕاوەستە وەرە دوام ئیتر کابرای کەنەمناسی لەسەر جادە لایدا، من‌و ڕەشیدیش بەدەرگەی ئەحمەدیە بەسەر قەڵات کەوتین‌و بەدەرگەی گچکە هاتینە خوارەوە، ڕەشیدیش لەسەر جادە بەلایکا ڕۆیی کە هاتمەوە ئاسەف دانیشتبوو ئینتیزاری ئەکردم ئیتر بەبێ ئەوەی چ قسە بکەم پاوپلی خۆم شووشت‌و جلکی خۆم لەبەرکردو چووم لەبەر ئاگر بەرامبەری دانیشتم، ئاسەف وتی: "ماندوونەبی" وتم دەستت ماچ دەکەم ئیتر هەتارێکی دامێ‌و وتی ئەمەی ئیمشەو بەکەس نەڵێیت، وتم باشە.

حەرەکاتی شێخ مەحمود دەستی پێ کردبوو، کەعەلی مەحموودی کاکە خانی لەحکومەت عاسێ بوو کوردایەتی لەهە، ێر بەدەرەجەیێك شیدەتی ستاندبوو کەنەتوانم بڵێم زۆر بەهیستریا ئەچوو، , لام سەبەبی هەرە گەورەی ئەم کوردایەتی‌یە عاسێ بوونی عەلی مەحمودو دیعایەی منەوەرەکان، خاسەتەن ئەم دووسێ تفەنگە بوو کەلەپاش هاتنی مەندوبی سامی بۆ هەولێر، شەوێك بەم شەوە تاریکەی بەهاردا بەهەولێرەوە نران، حەقیقەتەن ئەتوانم بڵێم ئەم دووسێ تفەنگە کاری هەزاران دیعایەی کرد. من تەنیعی کە لەگەڵ نەفسیەتی خۆم رێك دەکەوت هیچی تری لێ تێنەدەگەیشتم هەر ئەمەندەم ئەزانی کەمن کوردم‌و بەس وەواشم ئەزانی کەمادامەکێ من کوردم، ئەبێ کورد لەهەموو دونیا ئازاترین وەچاکترین زۆر جار سەعید سەید عومەر ئاغای زاوام لەسەر ئەم وەتەرە تووڕەی دەکردم عەقڵی پێ ئەدەهێشتم، ڕۆژێکیان ئەحمەدی خواجە ئەفەندی هاتە لای ئاسەف پێی وتم "یونس تۆ کوردیت..؟" وتم بەڵێ وتی:" کوا شاهیدت کەتۆ کوردیت؟" وتم "ئاسەف شاهێدمە" وتی: ئاسەف بەشاهید ناشێ" ئیتر ئەم‌نەزانی چۆن جوابی بدەمەوە، لەپاشان وتی:" من شتێکت ئەدەمێ، کەوتیان بەچی بزانین تۆ کوردیت، ئەم شتەیان نیشان بدە. دەستی درێژکردە باغەڵی دەفتەرێکی بچووکی دەرهێنا، لەناو دەفتەرەکە رەسمێکی دەرهێنا دایە دەستم وتی: "ئەمە شێخ مەحموودە مەلیکی کوردستانە" منیش رەسمەکەم وەرگرت زۆر کەیفم پێخۆش بوو کە رەسمی مەلیکی کوردستانم لابێ، بەڵام کوردستان کوێندەرە؟ ئەمەم نەئەزانی لەکەسیشم سوال نەدەکرد پاش دوورۆژ موجەلەیێکی میسریم شەق‌و پەق کرد رەسمەکانیم دەرهێنا وەك شریت بەسەمغ بەیەکترمەوە نووساندن "رەسمی مەلیکی کوردستانیشم لەگەڵ وان تێکم بەست ئەوسەری شریتەکەم لەدارێك خست‌و سەرەکەی تریشم لەدارێکی‌تر خست‌و دارەکانم لەسندوقێکی مۆقەوا چەسپاندوو دووکونم لەسندووقەکە خست بەم چەشنە "تەستەنبوڵە باقان"یکم دروست کرد لەمحەلەکە سەیری منداڵم ئەدا، کەدەگەیشتمە سەر رەسمی شێخ مەحموود ئەمووت: "ئەمە شێری شێرانە مەلیکی کوردستانە" بەم سورەتە شێری شێران‌و مەلیکی کوردستانم نیشانی منداڵان ئەدا کەهاوین هات مەکتەب تەعتیل بوو داوام لەئاسەف کرد کەئەمەوێ بچمەوە رانیە، خێرا موافەقەتی کرد، بەتەنیا ئادرمیانەوە لەکۆیە عوسمان سەعید بەگ کەکۆنە ڕەفیقی مەکتەبم بوو ئەویشم لەگەڵ خۆم هەڵگرت چووین کاروانچیمان دۆزیەوە بەمن‌و عوسمان ئێسترێکمان بەکرێ گرت، شەو لەخان نووستین بەیانی لەوسەری زوو کاروان باری کرد، هەموومان بەرێ کەوتین، هێشتا ڕۆژ لەهیچ لایەك هەڵنەهاتبوو، کەبەسەر چنارۆك کەوتین، لەژێر ئەم ئاسمانە شینە بەرینەدا کزەبای بەیانی بەپەنجەی سیحری یاری لەگەڵ رووی کردین هەموو شتێك تازە لەخەو هەڵسابوو گەرمایی ژیانی تێدا ئەجۆشا هەموو شتێك لەناو روناکی زۆر پاکی بەیانی لەناو ئەم فەیزە خودایە سەمای شادومانیان دەکرد لەهەموو لایێك مەل باڵیان رائەوەشاند لەسەر ئەم دار بۆ ئەوداره لەو قوچکە بۆ ئەم قوچکە زۆر بەنیشات‌و سووکی‌یەوە ئەهات‌و ئەچوون ئاوڕێکت لەپشتەوە بدابایەوە شاری (کۆیەت) لێوە دیار بوو کەتەمە دووکەڵێکی وەکو سەرپۆشێکی ئاوریشمی شین بەسەر دلارامێکی جل سپی دادرابێ ئەوهابوو، لەژێر ئەم پۆشینە شینەدا خانوە سپی‌یە لەگەڵ دروستکراوەکان لەمیانی ئەم خانوە سپی‌یە مل کەشانە خاڵ خاڵی سەوزت ئەدیت کەلق‌و پۆپی دارە بەرزەکانی حەوشەکان بوو، رەزەکانی کۆیەت وەك رووبارێك دەهاتە بەر چاو کەلەشیماڵی غەربییەوە لەچیای باواجی‌یەوە هەڵبوقڵێ بەشیماڵی کۆیەدا تارۆژهەلاتی شار درێژ ببنەوە، لەکەندولەندی رۆژهەلاتدا رێ ئەبوو تاچاوت ئەرۆیشت هەر کەندو دەشتایی درێژە چیابوو، کەدواییەکەی لەئوفقدا بەرێژە چیای دووکەڵ دەهات لەناو تەم شارابوونەوە کەسەیری پێشە خۆشت بکردایە دەشتی بەرینی بیتوێنت ئەکەوتە بەرچاو کەسەراپا پاوانێکی بەرین هەموو بەپوی سپی داپۆشراو لەلای ڕۆژئاواو ژوورییەوە بەچیا بەرزەکانی خۆشناوەتی‌وە لەلای ڕۆژهەلات بەدەربەندو چیا ڕەشەکەو جەنوبیشی (هەیبەت سوڵتان)بوو، ئەم چیایە بوو کەمنی لەسەر راوەستابووم، رۆناکایی تانەهات زیاتر تێنی ئەسەند، زیاتریش سینگ‌و دروشمی چیایەکانی بەدیار ئەخست ڕۆژ هەروەکو لەپشت فلکەی دەربەند خەرمانێك ئاگری تێبەربووبێ بەم چەشنە خەرمانەی تیشکی بڵێسەی سەند بەرە بەرە تانەهات جەرگی

١١

ئاسمانی سپیواژ ئەکرد تیشکی رۆژ لوتکە هەرەبەرزەکانی خۆشناوەتی روون کردبـووەوە بـەرەنگێکی ئـاڵتونی دایپۆشـتبوو بـەردەکانی رەنگـاو رەنـگ ئەبریسقانەوە هەر ئەتووت قایشن لەگۆپکەی ئاڵتون گیراون، لەدیوی بیتوێندا نوقق بەرین نی‌یە، بەڵکو بەرینایییەکەی هەر لەجنوبی شەرقەوەو بەس؛ چیا بەرزەکانی کوێستان یەك لەدوای یەك وەك هەور یەك بەسەر یەك کەوتوو بەبەر ئاسمانا هەڵچووو قەندیلیش وەك هـەورێکی سپی هـەموو ئزار لێوی بـەلێوی ئاسمانـەوە نـابوو مـاچێکی ئەبـەدی‌و سـەرمەدی کردبـوو هـەردوو لایـان لـەم ماچەدا وەستاو لێو لەسەر لێو مابوونەوە، هاژەی با فرەو چرپەی باڵدار زرەی زەنگوڵەی کاروان فرمە فرمی ئێستری مل قەوی کـە بـە عـەزمو سـەباتێکەوە بەردیان ئەشێلاو بەسەر چیا دەکەوتن، دەنگی "دەی های" هـەتیوە کاروانچی چاوڕەش پوزەوانە هەڵکێشراوی گورج‌و گۆڵ کـەوەکو سوسکەکە لەهەڵـەت‌و پەلەتی چیا بەلاریدا بەسەر دەکەوتن، ئەمانە هەموو جار جار منیان لـەم خـەوە خۆشە رانەپەڕاند کەلەباوەشی تەبیعەتدا ئەمکرد، راپەڕیم چ راپەڕینێك هـەموو یـەك پارچـە عاتیفـە، خـۆم سـەرخۆش سـەیری عوسمـانم کـرد ئـەو لـەمن سەرخۆشتربوو زەردەخەنیێکی زۆر جوانی لەسەر لێوی بوو، کەچاوە بچووکە شینە کشتەکانی تێبڕیم‌و وتی: "بەخوای دونیا جوانـە"، ئیتر هـەردووکمان بەدوای کاروانەکەدا رێگا زۆر نشێوە قادرمە قادرمەکەمان گرتە بەردەستمان پێکرد کەلەچیا بێینە خوارەوە هەردوولامان پەدەستەخۆمان نەبوو، پێکەوەمان دەستمانکرد بەگۆرانی وتن دووبارە چوومەوە ئەو رانیەی کەدونیام تێدا ئاسی دووبارە لەسەرو چاوەی ئاوی رۆنی قولە مەلەم کردو لـەژێر داربیە بەرزەکانی وەکو جاران پاڵم دایەوە.

لەم هاوینەدا بوو کە باوکم لەوەزیفەی کاتب تەحریراتی رانیە عـەزل کرا، ئەم خانوەی کەتێیدا بووین هین خۆمـانبوو باوکم فرۆشتی دوانـزە هێسـتری بەکرێ گرت، لەشەوێکی مانگەشەودا خۆمان ئامادەکرد کەبارکـەین مـاڵی ئێمـە خـەڵکێکی زۆری کـەوتبوێ تەقریبـەن ئـەهلی رانیـە بـەژن‌و پیـاوەوە هـاتبوون کەبـەرێمان بکـەن، لـەم شـەوە حادیسـەیێکی زۆر سـەیر لەماڵەکەی دراوسـێمان قەوما ئەویش مام عـەولای چایـەچی، چایخانـەیێکی بچووکی هـەبوو ئەگـەرچی بازاڕی زۆر گەرم نەبوو؛ بەڵام مام عەولا هـەروەکو رقە لەگـەڵ رزقی خۆی بکا، شەوتا درەنگ هەر خۆی چای بۆ خۆی تێ‌دەکردو گرامـەفۆنی لێـەدا، ژنێکی هەبوو ناوی فاتمـەخان ساڵێ دوانزە مـانگ چاوی ئەیێشا، فاتمـە خـان لـەسەر کەپرە بەرزەکەی ناوەندی حەوشـەی خۆیـان دانیشـتبوو گوێـی لـەغلو غلـوی ماڵی ئێمە راگرتبوو لەناکاوێك گوێمان لێ بوو کەفاتمـە خـان بانگی کرد: ئەوە کێیە لەکڕ دەرگـای ژوورەوەیە؟" ئافرەتێك لەسـەر گـوێ وانـدەی ئێمـەوە پێـی وت" فاتمە خان چیە؟" وتی "گۆرانە" لەکڕ دەرگـەی ژوورەوەیە" ئیتر ئافرەت شەش شەش هاواریـان دەکـرد "گۆرانە، گۆرانە" بەمـە ئـەم پیاوانـەی کـەلای باوکم دانیشـتبوون هـەموو بەجارێك راپـەڕین‌و دەورەی مـاڵی مام عـەولایان دا دەپانزە پیاوی بەتفەنگەوەش بەشخاتە لێدان هـەیوان‌و ژێر کـەپری مـاڵی مام عـەولایان پشـکنیەوە هیچیـان نەدۆزیـەوە هـەموو بـەجارێك سـەرکۆنەی فاتمەخانی قوربەسەریان کرد کەترساوە بۆیە وای کردووە بەڵام لەسـەر قسـەی باوکم سێ پۆلیسیان لەبەر دەرگای ماڵێ مام عـەولا بـەجێ هێشت‌و زەلامـەکان گەڕانەوە حەوشـەی ئێمـەو هـەزاران لەعنـەتی ئافرەتیـان ئـەکرد ئێمـەش منداڵـە گەل لەسەر گوێ‌سواندەکەی ماڵی ئێمە بەرامبەر بەحەوشەی مـاڵی مام عـەولا دانیشتبووین باسی خۆشی خۆشمان ئەکرد، لەم ئانەدا شڵپەیەك لـەبن کـەپری ماڵی مام عەولا هات هـەموو چاومان لێبوو کەزەلامێکی بۆرە راست بـووەوەو بەرەنگاری دیواربوو وەکو بەسـەر پێپیلکە بکـەوێت ئەوها بەسەرکەوت خۆی فرێدایە کۆڵان‌و هـەرای کرد لـەم ئانەدا پۆلیسـەکانی بـەردەرگا بەئاگاهاتنـەوە هەریـەکێکیان تفـەنگی پـێ‌بوو ئـەویش تفـەنگێکی پێوەنـا، چاومـان لێ بـوو کەرەتێکی برد بەڵام نەکەوت خۆی گرتەوەو وەك ئاسك دەستی کردە گومبەتە خۆی گەیاندە چەم لەم ئانەدا مام عەولا هاتەوە بەخۆی‌و ورگی زلی‌یەوە هاواری کرد چی‌بکـەم مـن لـێرە نـەبووم دەنـا وەڵا قورتـارم نـەدەکرد، پۆلیسـێك وتـی "چی، چی؟" مام عەولا وتی "دەخوا سەلامەتتکا ناهێڵی پیاو هەندێك خۆی لەپێش ژنان هەڵبکێشی!!" بەمە خەڵکەکە لەقاقای پێکەنینیاندا. لەمـە ورد ببینەوە کەئەم دزە لەکوێندەر خۆی شاردبووەوە لەپاشان زانرا کـەوەك تورەکە خۆی بەکەپرەکەوە هەڵواسیبوو، ئەم زەلامانەی کەلەدوای ئەگەڕان هەر سەیری کون‌و قوژبـن‌و دەوری خۆیـان کـردووە کەسـیان سـەری بـەرز نـەکردبۆوە کـە بیدیتێ بەم تەرزە ئەم دزە ناپەسەندە بەئەعجوبە لەبەردەستی دەپانزە بیست تفەنگچی رزگار لەزللەو هەتکی پۆلیس قوتار بوو.

ئەمجارەش هاتینەوە کۆیە، بەڵام ئەمجارە لەخانوی خۆمان دانیشتین من زۆر لەکۆیە نەمامەوە چووم بۆ هەولێر کەدەوامی مەکتەب بکەمەوە بەڵام زۆری پێ نەچوو لەگەڵ ماڵی ئاسەف دووبارە گەڕامەوە کۆیە.

ئێستا ساڵی ١٩٣٢ من لە (کۆیـە)م‌و سونفی چواری ئیبتدائیم‌و عومـرم چواردە ساڵە دیسـان کەوتمـەوە نـاو رێـك‌و پێکـی‌و ئینتـیزامی ژیـانی مـاڵی باوکم، شەڕو قیرەقیر نیەو هەروەهاش من ئاگام لەپارەو مەسرەفی بازاڕ نیە بەڵکو بەیانیان مەکتەب‌و ئێوارانیش لەگـەڵ کۆنە رەفیقی رانیـەم "عوسمـان" بەگەڕان رادەبوێرین، بەراستی ملـی خـۆم دایـە خوێنـدن لـەم ساڵە لـەئاخیر مانگـانی تـەدریس شتێك لەهـەموو کۆیـە روویدا بـەژن‌و پیاوەوە پێـی هـەژان، ئەتوانم بڵێم خودا بەرەحمەتی خۆی سەبەبێکی وای بۆ ئیجاد کردم کەمن لەم حادیسەیە دوور بکەومەوە.

مەوسیمی ئاخەلێوەی بەهاربوو، هـەموو قوتابی‌یـەك بەحەماسـەت خۆیـان بـۆ ئیمتیحـان ئامـادەدەکرد تیـم تیـم وەسـتابووین هـەر تیمـە ئێـواران لـەناو باخچەیەك لەباخچە زۆرەکانی دەوری شار کۆمەڵـەی ئەبەسـت‌و بەحەماسـەت تێ‌ئەکۆشی ئەو رۆژەی کەحادیسـەی تێدا قـەوما بـرادەری زۆر خۆشەویستم لەمەکتەب "بابەکە"ی حاجی مستەفا لەمەیانی دواندا پێی وتم: "یونس ئەتۆ لەکوێندەر سەعی دەکەی؟"وتم من‌و عوسمان هـەردووکمان لەئاشـان سـەعی دەکـەین، وتـی: "بۆچـی نایـەیت لەگـەڵ مـن‌و بابـە رەسـووڵ‌و سـەلاحەدین‌و حەمیدی تاهیر چەلەبی لەرووبار سـەعی بکـەین؟" جێگایـەکی زۆر خۆشمـان هەیە چایەخانە نزیکە هەموو جارێك کەویستمان ئەنێرین لەچایەخانە چامان بۆ دێت عەسر من‌و سەلاحەدین دێینە دوات پێکەوە ئەچین ئێمە تەنریخمان بەدەستەوەیە تۆش تـەنریخ لەگـەڵ خـۆت بهێنە، لەسەر ئەمـە ئیتفاقمـان کـرد کەمن گەڕامەوە ماڵەوە مەسئەلەکەم بەعوسمان وت، عوسمـانیش موافەقـەتی کرد عەسر قایمەقام خەبـەری ناردبوو کـە زیـارەتی بـاوکم دەکـا لەبـەر ئەمـە هەرچەندێکی خزمـەتکاریش هەبوون کەخزمـەتی مـەجلیس بکـەن بەڵام بـاوکم ئەمری کرد کەمن‌و عوسمان خۆمان ون نەکەین من ئەم ئـەمرەی باوکم زۆر پێ ناخۆش بوو، بەڵام چارەش نـەبوو ئەبوایـە ئیتاعـەتی بکـەم لەبـەر ئەمـە ئـەو وەختـەی کەسـەلاحەدین‌و بابەکـە هاتنـە دووام زۆر بەشـەرمەوە مەسـئەلەم تێگەیاندن‌و ئیعتزارم لێ خواستن بەجێیان هێشتم‌و رۆیشتن، منیش لـەپاش ئەوەی قایمقام هەڵسا رۆیی کتێبەکەم هەڵگرت‌و چوومە کۆنە هـەواری جارانم (ئاشان) دەستم کرد بەخوێندنەوە نیـو سـەعاتی پـێ نـەچوو گرمەیـەك هـات زەوی لەراندەوە دووسێ کەسم لەژوور بوون لێم پرسین ئەم گرمەیە چی بوو؟ وتیان مومکینە قایەچی بێ بەردی شکاندبێ" فیعلەن قایەچییەکان لەنزیك ئـەم شوێنەی کـەلێی بووم زۆر جار لەکانەکە بە تـۆپ بـەردیان ئەشـکاند بەمـە ئیقناعیم هات رووم وەرگێڕاوە سەر کتێبەکەی دەستم، هێندەی پـێ نـەچوو عوسمان بەهەراکردن هات زۆر بەشڵەژاوی‌و مشوەشیەوە وتی "یونس هەڵسە خێرا باوکت تۆی دەوێ" منیش بەراکردن بەدوای کەوتم لەرێگا لێم پرسـی چی قەوماوە؟ وتی: نازانم ئیتر مەراقم زیادی کرد لەگەڵ مەراقا راکردنیشم شیدەتی ساند، کەگەیشتمە ماڵەوە سەیرم کرد لەماڵی ئێمە شینە، لەخۆدانە،

لــەکوێندەربوویت؟" زوبـــانم تێـــک ئـــاڵاو وتم :"لەئاشـــان، لەئاشـــان" وتـــی خێرا بـڕۆوە ماڵـــێ کەچوومـــە دیـــوی ژوورەوە، بـــەجارێك بـــەرووما هاتن، دایکم، پوورم، مامۆژنم، ئامۆزاکانم، براژنم، خوشـــکم، بـــەجارێك لێیـــان ئەپرسـیم:" لـــەکوێ بووی، لەکوێ بووی؟" سەرم لێ شێوابوو، ئارەقە بـەدەمو چاوما ئەهاتـە خـوارەوە وەکـو کۆترێـك کەلەژوورێکا پشـیلە حەپسـی بکـاتو پـەلاماری خواردنی بدات بەم چەشـنە موتەفـەزیع سـەیری دەورەی خۆم دەکردو ئەمقیژاند :"لەئاشان بووم سەعیم ئەکرد چ قەوماوە؟ بۆ؟ ئیتر دوو دوو سێ سـێ ئەشـکی چاویـان ئەسـڕیەوەو پێنەکـەنین ئەیانوت (الحمدلله) بـەڵام فـاتم فـاتمی خوشـکم وەکو شێت لاشعوری خۆی پێدادام دەستی پێ کرد هەم لێم بدا هەم ماچم بکات، هەم ئەگریا هەم پێئەکەنی، من بەرامبەر ئەم کردەوەیـە هێنـدەی ئەمابوو شێت بم دڵم شەق با، تووڕە ببووم بەڵام سەرسامیش بووم بەرێکەوت لەم ئانە عوسمـانم بەفریاگەیشت زۆر خێرا مەسئەلەکەی تێگەیاندم کەبابەکەوە سەلاحو بابارەسوولو حەمیدی تاهیر چەلـەبی لـەرووبار بۆمبایـەکیان لەدەست تـەقیوە هـــەموویان کـــوژراون.. کـــوژران.. مـــردن.. بەگریانـــەوە رامکـــردە دەرەوە عوسمانیشـــم بەدوواکەوت چووینە رووبار دارو بـەرد ئینسـان بـــوون، هـــەموو بـــەجارێك ئـــەگریان، ئـــافرەت شەرمیان ئەمابوو بەزریکەو هاوار رایان دەکردە رووبار، هەر دارەمـەیت بنوو ئەگوێزرایـەوە، لـەم حەشاماتە ئەمتوانی بزانم کەچەند کەسن بـەڵام ئەمەندەم زانـی کەهـەر حـەمیدی تاهـیر چەلـەبی ماوە ئەویش بریندارە.

موتـەباقیتر هـەموویان مردوون گەڕامـە ماڵـەوە، تانیوە شەو هەر گریام پاشان بەدەم هەنیسکەی گریانەوە خەوم لێکەوت، پاشی دوو رۆژ چوومە زیارەتی حـەمید کـەبریندارپوو بـۆی گێڕامـەوە کەخزمەتکارێکی سەلاح بۆمبایەکی لەناو رووبار دۆزیبۆوەو خەبەری دابوونێ ئەوانیش تـەگبیریان کردبـــوو کەهەڵیبوەشـــێنن باروودەکـــەی لێ دەربـهێنن، سـێچوار رۆژ بـوو خـەریکی بـوون زۆرترین بورغیو بزماریان لێ دەرهێنابوو، بـەڵام بورغیـەکی گـەورە لێیـان عەسـی ببـوو سـەلاح سوێندی خواردبـوو کەئـەبێ هـەر دەری بـهێنێ لەبەر ئەمە هەر ئیسراری لەسەر ئەکرد، پاشـان کەمـەئیوس ببـوو بۆمبایەکـەی بـە دوو دەسـت هەڵگرتبوو بەقوەت بەردێکی زەلامی پیادادابوو بۆمبـا تـەقیبوو کـەس سـەری سـەلاحەدینی ئـەدۆزیبوەوە، بابەرەسـوولو بابەکـەش وەکـو بەبرینداری هەڵیانگرتبوونەوە بۆشەو مردبـوون، دوو منداڵـی تریـش کەبـەرخیان ئەشووشـت




گریانـــە، بـــاوکم لـــەزاری مزگـــەوت راوەســـتابوو، پێـــی وتم: "یونـــس

هەردووکیان دەست بەجێ مردبوون. ئیتر بەم سوورەتە ئەم بۆمبایانەی کەئینگلیز لەپاش حەربی عالەمی یەکەم لەسەر ئەمەی کەکۆیە حاکمی سیاسیان دەرکردبوو لەحکومەتی ئینگلیزی عادیلە عاسی ببون، بەکۆیی دادابوو لەوەختی خۆی فەقێیەك و دوو مریشکی پێ کوژراوە. خانوەهای پێ وێران کردبوو، بەڵێ ئەم بۆمبایەش لەم بۆمبایانە بوو کەلەرووبارەکە ئەوساکە نەتەقیبوو بەڵام لەپاش دەساڵ لەمەوسیمێکی کەدار بەری ئەدا گوڵ ئەپشکوت ژیان تازە ئەبۆوە داری پێنج لاوی تازە هەڵچووی بڕی گوڵی جوانی هەڵوەراندن چرای ژیانی کوژاندنەوە.

* * *

ئێستا من لەساڵی ۱۹۳۳م ستفی پێنجی ئیبتدائیم، لەم ساڵە مەجرای ژیانم گۆڕا، لەدەوری منداڵی هاتمە دەورێکی تر کەئیتزانێکم پێ وەرگرتبوو لەم ساڵەدا:

۱- دەستم پێکرد بەوردی دیوانی حاجی مەلاقادری کۆیی موتالەعە بکەم بەڵکو شیعرەکانیم ئەغڵەب لەبەر کردبوو، دیسان مام کەزۆر بەوردی گوڵلەشیعرو قەسائیدی شاعیرانی کۆیی وەکو (عەونی، راجی، عاسی، حسێنی) رابگرم و لەبەریان بکەم بەمەش ئیکتیفام نەدەکرد هەر شیعرێکی کوردیم بکەوتایە بەرچاو ئەمنووسی یەوەو لەبەرم دەکرد تا ئەغڵەب شیعرەکانی (وەفایی، کوردی، بێکەس، زێوەر، پیرەمێرد)م لەبەر کرد زۆرم لا خۆش بوو کەبەیانیان حەمەرەش و غەریب موستەفا لەمەکتەب ئەهاتنە دەرەوە بەحەماسەوە شیعری (ئەی وەتەن مەفتونی تۆم)ی بێکەسیان ئەخوێندەوە لەم ساڵەدا بەرەبەرە هەستم بەخۆم دەکرد لەزەت لەشیعر وەرئەگرم بەڵکو زۆرم لا خۆشە.

۲- عەبدولکەریم سەید ئەحمەد کەبەخزمایەتی ئەگەیشتەوە من بووە رەفیقم عەبدول کەریم بەسێ چوار ساڵ لە من گەورەتربوو کوڕێك بوو زۆر رای لەخۆبوو خەیاڵێکی واسیعی هەبوو، باوکی سەید ئەحمەد لەشاعیرەکانی کۆیە ئەژمێردرا بە (حسێنی) ناسرابوو بەڵام لەبەر ئەوەی چونکی ئەشعاری وەتەنی نەبوو کەس ناوی نەدەبرد، لەئەوساتی غەیری گەنجەکانیشدا لەبەر فەقیری ئیهمال کرابوو بەڵام (حسێنی) وەتەبێ زۆر پاکی بەو ئیهمال کردنەبووبێ بەڵکو ئەم لەدونایی خۆیدا دونیای فەقیری و ئەدەب زۆر قانیع و رووخۆش ئەژیا، بابە شێخ زۆر رەفیقی (عومەر عەبدوڵلاو ئەحمەدی حەمە مەلاو عەونی شاعیر بوو) بەتەبیعەتی حال منیش تێکەڵی ئەم تیپە بووم زۆری پێ ئەچوو کەلەگەڵیان بوومە رەفیق، عەونی لەبازاڕ بەقاڵ بوو لاوێکی قەدە بالای رەنگ گەنمی چاورەشی چاو گەورە لووتێکی یەکەوانەی ناوەندی بەسەر دوو لێوی تێك قرمساوی بارێکا هاتبووە خوارەوە، زۆر کەم قسەی دەکرد، بەڵام ئەغلەب قسەکانیشی نوکتەو حیکایەتی عیبرەت ئامێزبوو، وەستا عەبدوڵای ئامۆزای ئاسنگەر بوو ئەیدەزانی بخوێنێ و بنووسێ، بەڵام لەعەقڵ و رەئی و تەدبیرا هەموو لایەك ئیعتمادیان لەسەر ئەکرد، عومەر کوڕێکی سوورەی مووزەردی چاوکاڵی بەشەوکەت بوو زۆر بەقاقا پێدەکەنی روحێکی گوشاد دەنگێکی خۆش دڵێکی بێ گەردی پاك بەراستی مێر کوڕانی ئیحراز کردبوو، ئەحمەد کوڕێکی بارێکەلەی زەردی چاوگەورەی لوت خڕ بەڵام نێوچەوانێکی پان، هەیکەلێکی جوانی هەبوو زۆر دەنگی خۆش بوو زۆریش تەفەنونی لەشەدە بەستن دەکرد چاو لەدەر بوو دۆستداری عەشقبازی ئەکرد، بەراستی مێبازی بەئیرس بۆ مابۆوە بەڵام لەسەعی ئەکردن چاوم لەوان نەدەکرد بەڵکو بەتەنها لەماڵەوە زۆر سەعیم ئەکرد لەم تەئریخە لەگەڵ ئەم برادەرانە فێرە جگەرەکێشان بووم بەڵام لەماڵەوە بێجگە لەخوشکم زیاتر کەس نەیئەزانی کەمن جگەرە ئەکێشم.

۳- جارو بار هات و چۆی مزگەوتم دەکرد، فەقێیەکانی مزگەوت زۆر حورمەتیان ئەگرتم، جارجاریش لەسەر ئەمە موجادەلەیان لەگەڵ دەکردم: کەبۆچی نوێژناکەم؟ بە کافر ئیتیهامیان دەکردم بەجەهەنەم تەهدیدیان دەکردم بەڵام من زۆر بەتوندی جوابم ئەدانەوە تاوای لێ ئەهات کەپێیان بڵێم (ئێوە عیبادەتی ئەوهام دەکەن وەیا بڵێم "وەرن تێم بگەیێنن کەدین چی یە؟" لەسەر ئەمە دوورودرێژ ئەکەوتینە موجادەلە ئەم موجادەلەیەی من و هجوومی ئەوان رەدی فعلێکی لەئەفسمدا ئیجادکرد، کەتووشی شکوك ئەهاتم وەشکەکەشم ئەمەبوو خودا چی یە؟ زۆر چاکم لەیادە کەجارێکیان بەمنداڵی لەدایکم پرسی بوو: تۆ بۆ نوێژ نەکەیت؟ وتی: "بۆ خوا کوڕم" پێم وت: "خوا لەکوێندەرە..؟" وتی:" لەهەموو شوێنێکە، نازانم" گریام وتم ئیشانم بدە خوام دەوێ" ئیتر زللەیەکی لێدام ئەم زللەیە هاوێشتمیە سەر ئەمە کەخوا بەشتی بەترس بهێنمە پێش چاوی خۆم دیسان لەبیرمە لەرانیە جارێك مەلا حەوێز ئەفەندی (معەلیم) دەرسی دینی پێ ئەوتین لێم پرسی: مامۆستا خوا چۆنە؟ جوابی دامەوە: خوا چ رەنگێکی نی یە، جیسمی نیە، بەهیچ ناچێ بەڵام هەیە ئەبیسێ گوێی نیە، ئەدوێ زوبانێ نیە تێگەیشتی؟ وتم: "چۆن جیسمی نیە، بەڵام هەیە؟ کەوابوو نیە" لەسەر ئەمە چوار داری لەدەستی دام ئەو دارانەی مەلا حەوێزە ئەفەندی وەك زللەکەی دایکم ئەم سونالە زەهیبەی لەمێشکمدا نیشتمەوە ئەم جارە لەگەڵ ئەم فەقێیانەی کەموجادەلەم دەکردن ئەم رەدی فیعلەی کەلەئەفسمدا هاتبووە وجوود هەرگیز ئەمئەویست کەبەتەنها لەم حیرەتە بمێنمەوە بەڵکو (ئینتیقامەن وە ئیستیهزائەن) بەئەزانینیان پێم ئەوتن "ئەگەر راستە خوا دەناسن خوام پێ بناسێنن، ئەم تەکلیفە زۆر جاران ئەوانی ئەهاویشتە سەر ئەمە کەلەدائیرەی سورەتی "قل هوو الله احد"دا تەعریفی خوام بۆ بکەن، بەڵام من جوابم ئەدانەوە (کێ ئەڵێ ئەمە وایە) ئەیان وت: خوا دەفەرموێ. ئەمووت "کێ گوێی لێ بوو کەئەمەی فەرموو..؟" ئەیانوت: "تەبیعی پێغەمبەر" ئەموت: کێ گوێی لێ بوو لەگەڵ پێغەمبەردا کەخوا ئەمەی پێ فەرموو..؟ ئەیانوت عەجایێب ئەمە وەحی یە هەر بۆ زاتی موبارەکی پێغەمبەر هاتۆتە خوارەوە کەسی تر گوێی لێ نابێ. ئەمووت: چ مەعلووم کەئەم تەعریفە هەر پێغەمبەری خوا داینەناوە، وەئەویش وەکو ئێوە خوای نەناسیوە..؟ بەمە زوبانیان ئەبەسترا تووڕە ئەبوون ئەیان وت: "هێشتا تۆ جاهیلیت" هێشتا ناتوانی ئیعرابی "ضرب عمرو زیدا" بکەی چۆن ئەتوانی کەپێغەمبەر بەخواتەناس ئیتیهام بکەی؟! ئەمووت باشە تووڕە مەبن، من کوردم عەرەبی نازانم چ عەیبی تێدا نیە کەئەزانم " ضرب عمرو زیدا" چۆن ئیعراب ئەدرێ بەڵام ئێوە ئیسلامن و خوا ناناسن، ئەمە عەیبە! لەسەر ئەمە بارەها تێك ئەچووین لەلایان ئەهاتمە دەرەوە ئەون منیان بە(مولحید) منیش ئەوانم بەجاهیل و درۆزن ئیتیهام ئەکرد.. عوسمان سەعید چوو بۆ رەواندوز من زۆرم کرد کەباوکی لەکۆیە بەجێی بهێڵێ بەڵام هەرچەندێکی خۆی رازیبوو ئەما باوکی مومانەعەتی نیشاندا، بەمە لێك تەفریق بووین، ئێستا والەساڵی ۱۹۳٤ چوومە سنفی شەشەم.

۱- برادەرەکانی مەکتەبم: عومەر عەبدوڵلاو ئەحمەد عەبدولکەریم، ئەحمەد هەرسێکیان لە (بەکەلۆریا) راسیب بوون و مەکتەبیان تەرك کرد دەورەی ئێمە لەدەورەی پێش خۆمان منداڵتربووین لەبەر ئەمە ئیدارەی مەکتەب بەهەموو وەسیلەیەك تەشجیعی ئەمەی ئەکردین، کەموتەسیل سەعی بکەین ناوی کۆیە لەناو ناواندا زیندو بکەینەوە، دوو سێ ساڵ بوو مەکتەبی کۆیە لەئیمتحاناتی وزاریدا (بەکەلۆریا) یا یەك ناجیح یا دوو ئیکمال هەبوو بەس.

تەشجیعی هەئیەتی مودەرسین ئێمەی بەنازکردبوو وەنازەکەشمان قبوڵ دەکرا، هەموو لایەکمان تووشی غرورێك هاتبووین ئەم غرورە سەوقی ئەکردینە سەر ئەمەی کەرقە لەگەڵ یەکتر بکەین حەقیقەتەن لەسنفدا زۆر موتەنافیسی یەکتر بووین و موعەلیمەکانیش ئەم موئافەسەیان لاخۆش بوو.

٢- ئاخیری ساڵ هات، حەفتەیەک لەپێش ئیمتحان (زەکی ئەفەندی) کەموعەلیمی تەئریخ بوو هاتە ژوورەوە موجەلێکی (الهلال)ی میسری بەدەستەوە بوو، هەروەکو جاران وەکو ئەسکەندەرنامە بخوێنێتەوە ئەم سوورەە بەئیشارەتو بەدەنگ، خولاسەی (دوەی مەمالیکی) بۆ تەقریر کردین لەپاشان وتی لەم موجەلەیەدا (فال نامە) هەیە فالتان بۆ بگرمەوە بزانن موستەقبەلتان چۆنە؟ ئەمری کرد یەکێکامن بەرامردن چوو لەبازار هەندێکی برنج هێنا ئیتر لەدەوری کۆبووینەوە، یەک یەک چاومان ئەنوقاند بەسێ ئەموست هەندێک برنجمان هەڵئەگرت لەپاشان دانەکانیمان ئەژمارد کام رەقەمی بگرتایەوە، (زەکی ئەفەندی) سەیری ئەم رەقەمەی ئەکرد ئیتر هەر کەسە جوملەیێکی خۆشو ناخۆ بەری دەکەوت، نۆبەی من هات منیش رەقەمێکم ئیجاد کرد سەیری رەقەمی کردم وتی (لايمكن ان تنجح في الحياة لأنك تريد ان تقتل عصفورين بحجر واحد، فيطران منك وترجع ان بخفي حنين) بەمە رەفیقەکانم لەپێکەنینیان دا، من چاوم پڕ بوو لەناو بەڵام خێرا دەستم درێژکردە پەنجەرەکەی پشتەوەم قورئانێکم زۆر بەتەهەورەو سوێندم خوارد کەمومکین نیە ئەبێ من هەر ناجیح بم وە لەحەیات سەربکەوم لەسەرە ئەمە زەکی ئەفەندی رووی وەرگێڕایە قوتابیەکان وتی" فال درۆیە، هەرکەسێ عەزمی هەبێ ئەو ناجیح دەبێ" ئینجا پێی زانی کەلەوەختێکی ئەوها ناسکدا شتی واهێنانە مەکتەبو قوتابی بەرەو خورافات راوندن چەند غەلەتە.

٣- لەعەینی رۆژدا معەلیمی کیمیا (فەخری ئەفەندی سامی) سنفی شەشی کۆکردەوەو وتی" ئینشائەڵلا ساڵێکی تر چاوتان لەم سنفە نابینم، لام محەققە کەزۆرترینتان دەرئەچن و دەکەونە شاران هەندێکتان دەخوێننێتەوە، هەندێکیشتان مل ئەداتە لایکی تر لەبەر ئەمە بەپێویستم زانی کەئیمڕۆکە ئاخیر جار کۆتان بکەمەوە رازو گلەیی لەیەکتر بکەین بادڵمان لەیەکتر نەمێنێ، لەهەموو شتێک خۆشتر زەکرەیاتی خۆیە، من گلەین لەهیچ کامتان نیە هەمووتان ساعیو بەئەخلاقن وە تێکەیشتوون، ئەگەر دڵی هەرکامێکتانم شکاندبێ لەسر مەسلەحەتو قازانجی ئەو کەسە بووە وەلەقەراری دڵی خۆمدا لەم تەهەوردی خۆم زۆر پەشیمان بوومەوە.

برایانم ئێوە ئینشائەڵلا دەرئەچن و ئەکەونە حەیاتی تەحسیلەوە بەڵام حەز دەکەم کەژیانتان تێبگەیێنم: ژیانی تەحسیل وەک ئاوێنەیەک وایە کەژیانی حەقیقی تێدا دیارە، بەڵام ژیانی حەقیقی وەک موسابەقەی ریازە وایە ئەوی چاک تەمرینی کردبێ و نەترسێ ئەو کەسە هونەر ئەباتەوە ئەبێ ئێوە تەمرین زۆر بکەن تەحسیلی ئیبتدائی موقەدیمەیەکی زۆر بەسیتی عیلمە، ئەبێ تەمرین زۆر بکەن و سەیری ئەم ئاوێنەیەش بکەن کە چۆن پێشکەوتووە ئێوەش خاسیەتی ئەو بگرن، مەترسن ترسان گەلێ شت لەدەست ئینسان ئەدا، ئێوە ئەچنە شاران ئەنواعی دەمو چاو ئەبینن، ئەنواعی تەبائیعو ئەخلاقتان تووش ئەبێ و ئەنواعی جەمعیاتان تووش ئەبێ.

مەترسن موداخەلە بکەن تەشریکی مەساعیان لەگەڵ بکەن بەڵام ویجدانی خۆتان موعەزەب مەکەن هەر ئیشێکی کە کردتان سەیری ویجدانتان بکەن، ئەگەر موعەزەب بوو ئەمە گەورەترین جەزایە ئەگەر مەعود بوو، ئەمە بەقیمەترین موکافاتە، ئیتر ئێستا یەک یەک بێن موسافەحەم لەگەڵ بکەن و خوداحافیزتان بێ، یەک یەک هەڵساین دەستیمان گوشی ئەویش بەرووماین پێ ئەکەنی بەچاوێک کەهەموو برایەتیو خۆشەویستی بوو، لێمان ورد ئەبۆوە فەخۆی ئەفەندی هێشتا لەژوورەوە بوو کەمەلا عەبدولڕەحمان ئەفەندی مودیر هات ئێمەی دووبارە ختەوە سنف، لەبەردەمان راوەستا وتی "پاش نیوەڕۆ هەمووتان وەرنە مەکتەب لەلای من چا بخۆنەوەو تەعلیماتی ئیمتحانیش وەربگرن"

پاش نیوەڕۆ کەهاتینەوە لەحەوشەی مەکتەب فەقێ مەحمود فەراش سەماوەرێکی گەورەی لەبەردەمی خۆی دانابوو، تەختو کورسیش ریز کرابوون ئیتر مودیرە ئەفەندی لەناومانا ئەهاتو ئەچوو جغارەی دایە جغارەکێشەکان لەپاش ئەوەی کەگەلێک نەسیحەتی کردین کەئۆپیە ئەکەین وتی" ج ئیحتیاجی نەسیحەت ناکات هەروەکو بۆ ئیدارە مەعلووم بووە دەورەی ئیمساڵ زۆر لەدەورەکانی رابردوو باشترە، ئومێدیش وایە کەدەورەی ساڵی ئاتی لەدەورەی ئێوە باشترێ.

سالی ١٩٣٥

لەپاشئەوەی هاوینێکی زۆر خۆشمله" مەلا زیاد" رابوارد لەم هاوینەدا بوومە کتێبە مەزرەعەی توتنی خۆمان لەگەڵ عومەری عەلیەگۆج ناوتووتنەوان بوو زۆربەکەیفو تەشقەلە رامبوارد،گەڕامەوەکۆیە باوکمو ئاسفە ووتیان کەئەبێ بچم بۆ هەولێر لەوێ لەسانەوی بخوێنم، ئیتر ئۆوتمبیلم گرتچوومە هەولێر لەوێندەرێش بۆسیاحەت چوومەکەرکوکمالی کاکەم حەمیدکەئەوساکە بەهیە کچی خالمی گواستبوەوە، چوومله‌مالی بەهیە میوانبووم، زۆر خزمەتیانکردم کەمەکتەبکرایەوە حەمدی هەمووکتێبی سوونفی یەکی متەوەسیتەوەقاتێک ئەلبەسەیجوانی بۆکردم ناردمیەوە هەولێر، کەمەکتەبکرایەوە چوومە میتەوەسیتە، خۆم لەسنفی یەک تەسجیل کرد.

١- دیسانگەڕامەوەناوشارو هەڵلای براژنم و کاکەمسەعدی، جاران شەڕیان لەگەڵیەکتر دەکرد لەسەر ناگزووری ئێستاشەڕەکەیان ئەغلەب لەسەر ئەحواڵی کچەکانیەتی کەیەکێکیان لەکەرکوک ژنی کاکەم حەمید، ئەویتریان ژنی کاکەم ئەسەف بوو، بەڵام منوەکو تاکەمۆدەکەی سەرکۆشکم ئیشغال کردبوو، ئەوها دورنەوێستام جارجار بە ووتارێکی ئەرمهەردولامساردئەکردەوە، ئەم مۆقفەی‌من، کەکۆتری ئاشتیبووم، زۆرجاری وائەبوو، ساچمەی شەرم بەسەروگوێلاک ئەکەوت،ئەمجازۆری پێنەئەچوو هەردوولا بەرامبەر بەمن پەشیمان ئەبوونەوە زۆرجاری واهەبوو کەبەسەر ئاکۆکی بەردفەردا موەفق ئەبووم، مودەتی سێ چوار ڕۆژ لەماڵەکەم دەرم ئەپەڕاد.

٢-برادەرەکانی مەکتەبی شعوبەم هەموو هاتبوونە متەوەسیتە بێجگە لەنازیرەکەکان ئەبێ ، کەلەبەر سقوتکردنیان مەکتەبیان تەرک قەرمووبوو، هەندێکیان ببونە پۆلیس هەندێکیشیان بێئیشلەهەولێر ئەسوڕانەوە، زۆر لەسەر شەقام تووشییەکتر ئەبووین زۆر بە ئیحتیرامەوە سەلاممان لە یەکتر ئەکرد. ئێمە قوتابیە غەریبەکان (کۆیی وشەقڵاوایی ورەواندزی لە هەولێر بە عینایەتێکی تایبەتی معامەلەیان لەگەڵئەکرا وە بە چاوێکی زۆرموقەدەر سەیر دەکراین، کەس ڕقی لە ئێمە نەئەبۆوە،بەڵکو(بالعكس) محەبەتمان ئەتوانم بڵێم لە دڵی هەمو هەولێریەک هەبوو، چونکە وایان ئەزانی بە ڕاستی کوردین مەسدەری وەتەنییەتو حەماسەت نموونەی کورد زوبانێکی فەعالین، لەبەر ئەمە قوتابییە هەولێریەکان زۆر خۆیان لێ نزدیک ئەکردینەوە،زۆر بە ئینتیباهو حەماسێکەوە گوێیا لە شیعرە حەماسیەکانی( عەونی،دلاوەر، بێکەس،زێوەر،ئەحمەد بەگ،)رائەگرت کە بۆمان ئەخوێندنەوە لە پاش نیوەڕۆیان لە چایخانەی مەگردیج کە هەم مەکتەبەو هەم چایخانەیەک بوو کەتایبەتی قوتابی لێ دائەنیشتن، لەم چایخانەیە بە(مسامرات)وخۆشی بە شەویش لە ماڵی قوتابیەکانی کۆیی کە لەگەڵشەقڵاوەیی ورەوانوزیەکان موشتەرەکەن لە محەلەی عارەبخانوێکیان گرتبوو، بە گۆرانیو ئەشعاری وەتەن ڕامان ئەبوارد ئەغلەب شەوانی جومعە تا درەنگ دائەنیشتین، لەهەولێریەکان خاستەن(فەتاح جەبار) کەبەخەسرەو مەشهور بوو وە(جەلال قادل)وە( مستەفا محەمەد)وە(برهان محەمەد) کەبەجاهد مولقەبیوو، ئەمانە دەمو سات لەگەڵمانبوون، فەتاح خەسرەو کوڕێکی چوارشانەی بالابەرزیئەسمەری، دەستوپلشەڕانی بوو، زۆربەوشەخسیەتانە ئەچوو کەلەسینەما ئیشانئەدرێ، شەڕانی بەڵام دەمبەپێکەنێ، ڕاست، زۆر

جوامێربوو، تەقریبەن هەمووقوتابییەکانی هەولێر لەشەقو قسەئەترسان، ئەیان ئەتوانی کەلـەوتاری دەربچن، خەسرەو بەنیشتیمان پـەروەرێکی(متطـرف- موتەتـەریف) ئەناسرا، وەیـەك لەمکەسـانە بـوو قیـادەی ئـەم موزاهەرەیـەی کردبـوو، لەسـاڵی١٩٣٢دا بەرامبـەر بەحکومـەت نیشـانیاندابوو،زۆرجـاران کەلەمەکتـەبی مگردیـج دائەنیشتن وە ئەکەوتنە باسـی دوورو قـووڵ، ئەگـەر یەکێکی ئاجانیز بهاتبایەخێرا مگردیج ئەفەندی بەلامانەوە ئەهات بەدەنگێکی هێواشـەوە ئـەیگووت"کوونشـمەین" یـەعنی"مـەدوێن"مگردیـج ئەفـەندی نەرمەنیـەکی بـەناوی سالان کـەوتو پیـاوێکی باریکەلـەی سـپی،چاوشـین، رووچرچ قژ سپی، زۆر پاکوخاوێن بوو، بەڕاستی زۆرقوتابییەکوردەکانی خۆش دەویست، ئێمەش زۆرحورمەتی ویمانئەگرت.

٣-زۆرم حەز ئەکرد کە سەعاتەها لەگەڵ جاهید پێکەوە دانیشین باس لە شیعرو ئەدەبیات بکەین ،ئەو هەر وەکو(جەبار ئاغا کانی) کەمامی جاهید بوو، شاعیرێکی موناسـیب بـوو،شـیعری زۆر تـەڕو غـەزەلیاتی زۆرگـەرمی خۆیوکانی بۆ ئەخوێندەوە، منیش ئەشعاری غەرامی شاعیرە مەشهوورەکانم بۆ دەخوێنـدەوە، جاهید کوڕێکـی بەشـەوکەتی دەمبەپێکەنینی شـۆخ بـوو، هەڵسـتانو دانیشـتنی زیندەگـیو گەنجایـەتی ئەبەخشـی، بەئەلبیسـەی زۆر جوانو پارەیـەکی زۆرەوە هەتا لەدەستی بهاتبایە خۆی لەئەلزەتو سەفاهەت دوور ئەئەکردەوە ئێمە تەبیعی هەر هەڤاڵی چایەخانەی مگردیج بووینو بەس، زۆر جـاران ئەسـیحەتم ئـەکرد کەجەوهـەری ئـەدەبی خـۆی بـەم سـەفاهەتە ئەکوژێنتـەوە، ئـەدەب بـەبێ سـەقافەت چ قمـەتی نیـە، رووبداتـە خوێنـدن. هەروەکو جاهید لەمەکتەبدا سنفێك لەپێش منەوە وو لەئەدەبدا پایەکی بەرزی وەرگرتبوو، زۆر ئەم وتارانەی منی لا مـەرغوب ئەبوو بەڵکو ئەیووت "حەیات فورسەتێکە زۆر بەقیمەتە بەخەفەتو مێشك مەشغوولکردن لەدەست خۆمانی بدەین جارێکیتر ئەم حەیاتـەمان بۆ ناگەڕێتەوە، کەبـەرندو خراباتی تکراری بکەینەوە، حەقیقەت ئەمەیە کەمنی تێدام دونیای من ئەم دونیایەیە کەخودا لەقورئاندا سۆفیو مەلار شێخەکانی پێ هەڵخەڵەتاندووە ئەویش: مەی، کچی جوان، شیعری خۆش، کەیف خۆشیە ئەمەی ئەووتو بەرووما پێئەگکـەنی بەلام من وەنەبێ وشە گەرمـە بەتیەئـەکانی (جاهید) زۆرم تەئسیر تێبکات، بەڵکو (بالعکس)بەیەکێکم دائەنا کـەخۆی بەدەسـتی خـۆی ئـەکوژێو ئـاگری زیرەکیو جەوهـەری ئـەدەبی خـۆی ئەکوژێنێتـەوە، زۆرم پـەرۆش بـوو کەبـەم تەرزە ئەم لاوە بەرەو کەوتن، بەرەو سووك بوون بەرەو تاریکی بڕوات، لەگـەڵێك موناقەشاتو وتاری بەینی خۆماندا، هەستم بەخۆم دەکرد کەهیچ نازانم زوو تێگەیشتم کە خوێندنی مەکتـەبو دەرسـەکانی زانینەکـەی لەوانە نیـە گـوێ موجادەلەیێکی پێ بەریەوە لەبەرئەمە زۆر بەحەماسەتەوە لەکتێبخانەی کاکەم سەعدی دەستم پێکرد کەموتالـەعات بکەم، لەپێش هەموو شتێکا، تەئریخی سەورەی فرانسەو تەئریخی یۆنانم بەتورکی موتالەعە کرد، لەپاشان تـەئریخی ئیستقبالی جـەلال نـوری مەشـهوورم هەرسـێ جـوزە تـەدقیقو خوێنـدەوەو تـەئریخی کـوردو کوردسـتانی ئـەمین زەکـی بـەگو تـەئریخی بابـان سـۆرانو موکریانی سەید حسێن حوزنیم بەکوردی خوێندەوە، ئەمانە هەمووی دروشمی رابوردوویان هێنامە بەرچاو، لەگەڵ خۆم زۆر موجادەلەم ئەکرد، مام بەرەبەرە مێشکم بکەمەوە، تەقدیری تەئریخو تەنفیزی بکەم.

لـەم تەئریخـە بـوو کـەدیوانی نـالیم زۆر بـەوردی خوێنـدەوە، شـیعرە جوانەکانی نالی لەگەڵ شیعرە ئاگرینەکانی حاجی قادر لەمێشـکمدا لەسـەر زەعامەتی ئەدەبی شەڕیان بوو، لەم شەڕە شتێکیان بەمن بەخشـی، ئەویش بۆ شیعرو ئەدەبیات رواندمیان، زۆر خـەیاڵی وام لەمێشکدا بوو کەحەزم دەکـرد بـەناو خـەلقیدا بـەرپایان بکـەم خـۆم ئیمتحـان کـرد کەئـەتوانم شـیعر دابنێـم شـەوێکیان تـا درەنگ ئەنووسـتم قەسیدەیێکی پانزە بەیتیم دانا، کەتەسـەوری دایکێکم تێدا کردبوو، بۆ رۆڵە لەسەورە کوژراوەکەی چۆن ئەگریا! ئەمە یەکەم شیعر بوو کەدامناوە، ئێستا تێئەگـەم، ئایا بۆچی قەسیدەیێکم لەسـەر ئیلابی چاوی کچێکی جوان دائەنا؟ ایا ئیحساسم ئەبوو؟ یان لاو ئەبووم..؟ بەڵێ هـەم ئیحساسو هـەم گەنجایـەتیم هـەبوو، بەلام نـالی کـەبۆ دڵداری رای ئەکێشـامو حـاجی قـادر کـەبۆ نیشـتمانپەروەری رایئەکێشـام ئـەم دوو شـا شـاعیرانە هـەردووکیان جیاجیـا تەئسـیری خۆیـان لـەدڵم کردبـوو، بـەلام موتالـەعاتی تـەئریخو موحیتـە ئاگرینەکـەمو ئەفسـیەتی بـۆ خزمـەت ئێنـوم ئەمانـە هەرسێکیان منیان بەلای (حاجی)دا دا هـەر کەئەمویسـت غـەزەلێکی غـەرامی بڵێم دەنگی پیرۆزی حاجی بەسەریدا ئەیقیژاندمو ئەیقەرموو:

باسی زولفی درێژو چاوی بەخەو

ئـەبڕاوە بـووە تـڕی خەسـرەوئیتر دەستم لەقەلـەم شل دەکـرد مـەجرای تەفکیرم ئەگۆڕاند. من لەهەولێر هەر شیعرێکم کەدائەنا، ئیشانی جاهیدم ئـەدا، ئەویش زۆر نازکانە بۆی تەسحیح ئەکردم ئەمە لەنگە، ئەم کەلیمە بەقافیە نیـە، ئەم وتارە زەعیفە، ئـەوهابی باشترە ئـەم بەیتە لەگەڵ هینەکـەی پێشـە خـۆی لـەوەزندا جیاوازن ئیتر بـەم سـوورەتە چـەوتو چێلی شـیعرەکانمی راسـت ئەکردەوە، لەپاشان دەستی ئەگووشیمو ئەیووت "تەبریکت ئەکەم" رۆژ بەرۆژ بـەرەو تـەکامول ئـەڕۆیت، تـۆ لـە موسـتەقبەلدا ئەبیـە شـاعیرێکی بـاش ئـەم تەشجیعەی جاهید رۆژ بەرۆژ مێشـکی ئەکردمەوە مـەراقی شیعر وتنـی زیـاد ئەکردم، لەمەکتـەبی متەوەسیتە موراقیبی عام کـەناوی (عـەلی حسـێن..) بـوو لەلایـەن خورشید سەعیدی مودیر دانرابوو بەجاسوس لەسـەر ئێمـە، ئێمـەش ئەم وەزیفە موبارەکەی (عـەلی)مان بە تـەجاوزو تـەحقیر کردنی تـەقدیر دەکرد، بەرامبەر ئەمە خۆی پێ رانەئەگیرا، ئەچوو لەلای مودیر شکایەتی لێ ئەکردین مودیـری مەکتـەبیش هـەر رۆژە چەشنە تـەکبیرێكو چەشنە بەهانـەیێکی پـێ ئـەگرتین بـەم حاڵـە رامـانبوارد، تـا ئیمتیحـانی ئیـهائیمانـدا. ئـەو رۆژەی کەنەتیجـەی ئیمتیحانمـان وەرگـرت لەچایەخانـەی مگردیـج زۆر خراپمـان لەیەکتردا، ئەو خۆیو چەند خزمێکی بوو، ئێمـەش حـەفت کـەس بووین، شەڕ کەوتە سەر جادە هەر دەست بوو رانەوەشا، بەرد بوو تێئـەگیرا، هـەر دار بوو ئەوەشێنرا، بـەم چەشنە شـەر سـەعاتێك دەوامـی کـرد، تـا قوەتێکـی کـافی لەپۆلیس هاتن ئێمەیان بردە مەرکەزی پۆلیس، لـەوێندەر کەفالـەتیان لەهـەموو لایێك وەرگرتو بەرەڵلایان کردین، سبەی هەر لەدائیرەی پۆلیس سولحیان پێ کردین، قەزیەیان سەدکرد.

لـەم ساڵە لـەهاوین لـەپێش وەی کەبچمـەوە کۆیـە، مـانگێك بـۆ رابـواردن چوومـە گونـدی (تیمـار) کەسـێ کیلۆمـەتر لەهـەولێر دوور بـوو وە موڵکـی سەعیدی سەید عومەر اغـای زاوام بـوو لـەوێندەر لەگـەڵ فەلاحـەکان زۆر زۆر یەکترمان خۆشویست، فەلاح -کرمانجەتی- وەکو منداڵێك وایە هـەر کەسێکی کەبەرووی زۆر پێبکەنیو بیلاوێنیتەوە خۆی بەئاسوودەیی ئەهاوێتە باوەش بەسـەهلی کلیلـی دڵـی خۆیـت ئـەداتێ، هێنـدەی پـێ ناچـێ کەلـە تەکتـەوە دائەنیشـێ داخـی دڵـی خۆیـت بۆ هـەڵ ئەڕێژێو باسـی نـاگزوری خۆیـانت بـۆ ئەکات، بەلام هـەر رێگەیـەکی کە بۆ ازادیو لـەم کۆتە رزگاربوونت کەنیشاندا خێرا سەرت بۆ ئەلەقێنێو بەقسەت ناکات زۆر لەئاغا ئەترسن زراویان لەمەلا چووە لەگەڵ ئەوەشا ئەگەر بزانن ئاغاکەیان لەحکومەت زەعیفەو بێ دەستەڵاتە بەهـەموو وەسیلەیەکەوە دزیو بەهـەموو رێگایەکـەوە درۆزنـی لەگـەڵ ئەکـەن، ئەگەر بشزانن کەمەلا لای ئاغا مەرغوب نیە ئەیکەنـە قەشمـەرجاری خۆیـان، ئەمما (شێخ) لای کرمانج فەوقی هەمو شتێکە، شێخێك ئەتوانێ زۆر بەسەهلی شەوکەتی ئاغا بشکێنێ، بەلام ناتوانی سولتەی ئاغا وەربگرێ.

زۆر جار (مەلا هەمزە)ی موختار کەلەوەختی خۆیدا سیپارەی خوێندبوو، بەتەنها کەئەیتوانی حروف لێکبکاتەوە لەقـەبی مەلایـەتی ئیحرازکردبوو، وە تـەمیزێکی عەقلیو تـەدبیری بێ هـەمتای لەچاو ئەوانی ترا بەخۆشـك ئـەبرد، بەڵێ زۆرجار ئەم مەلا هەمزەیە لام دائەنیشت لەپاش ئەوەی کەدوو سێ پارت

دامەمان نەکرد، ئەوباسی غەدرو زۆرداری ئاغاو من باسی بێ دەسەڵاتی و بێ هاوپەیمانی خۆیانمان بۆ یەکتر ئەکرد، هەستم بەمە کردبوو کەباس مەلا هەمزە لەوتارەکانم دەگات، وەهەر مەلا هەمزەشە گەر بیەوێ ئەم گوندە زەلامە کە (١٥٠) ماڵە بتوانێ کەشعورێك فرێبداتە ناو کرمانجەکان، بەڵام ئەمەندە بێ باوەڕبوو، کەپشتی بەبرای خۆی نەئەبەست وەبەسێبەری خۆی بڕوای نەئەکرد کەسێبەرە، ئەم بێ باوەڕیە خاسیەتێکە کەلەناو میللەتی جاهیلدا گەورەترین میکرۆبە لەلەشدا، لەخوێنی ئەم لەشەدا ئەژی.

لەشەخسی بێ پێچەوانەی کرمانجدا زۆر شت ئەبینرێ گەر بەوردی لێی وردبییەوە زۆر شتی لێ ئیستینتاج ئەکرێ لەپێش هەموو شتێکا ئەبێ لەگەڵ کرمانجدا زۆر واقیعی بی چونکە بێجگە لەمەی کەئەیبینی و بێجگە لەمەی کە ئەیبیستی چیتر لەژیان نازانی، چونکە ئەخوێندەوارو هیچ ئەزانن لەژیاندا هێشتا لەدەوری زراعیدا ئەژین و زۆر مەربوتی زەوی و خرافات و زگی خۆیانن هیچ وەختێک ئەمەلی وەعیی لێی ناکرێت، وەبەچاوی مەسلەحەی عامە سەیری هیچ شتێك ناکەن، ئەم سەبەبە کافیە کەتەبیعەتی چوارپێیان هەبێ بێجگە لەتەهدید ئەبێ لەهیچی تر ناترسێن بەڵکو تەهدیدی بێ تەنفیز لەئەزەر دەشتەکیدا چەشنە درۆیەک و خۆهەڵکێشانێکە کەپیاوی زۆو پێ سووك دەبێ و زوو لەپێش چاو ئەکەوێت، لە (تیمار) سەعید ئاغایان زۆر مەرغوب نەبوو، چونکە بەتەعبیری خۆیان بێ دەسەڵات بوو.. ئەم زاهیرەیە زۆر بەئاسانی و پەنهانی رەوشتی دێهاتی بۆ ئاشکرا کردم، کەئەویش بۆ ئەمەی نفووزی لەناو دەشتەکیدا بەقووەت بێ ئەبێ هەردەم لێدەر بێ پیاو خراپ بێ بەکوشتن ماڵ سوتاندن، مەڕ، ماڵات لێ دزین، هەتك پێ کردن، لێت بترسێن، پیاویش لەدەشتا بۆ ئەمەی کەخۆی ئەشکێنێ ئەگەر یدیعایێکت هەبێ، ئەبێ پیاوی دزو کارکردە رابگری، ئەگەر ئیدیعاشت ئەبێ، ئەبێ مل بۆ یەکێکی دەست ئەستوور کەچ بکەیت.

ئەمە خاسیەتێکە کەلەگەڵ خوێن و گۆشتی دەشتەکی تێکەڵ بووە ئەم خووەشیان لەمەرە مێژوێکی دوورەوە وەرگرتووە لەو وەختە وەرگێراوە کەدراوسێیەکانی کورد تەخت و تاجی کەیانی یان لەناوبردو بەتەحریزو هاندانی رۆئەسای عەشایر لەزد یەك جامی ئیتیحادی لێ شکاندوون، تەبیعی سیاسەتی (فرق تسد) لەزەمانێکی زۆر دوورەوە لەکوردستان تەتبیق کراوە، کەتەفرەقەو خودپەسەندی بەدەرەجەیەك (ترکزی) کردووە، کەئەتوانم بڵێم هەڵکێشانی مومکین نیە، تەبیعی ئەم خود پەسەندیە کەهەموو مەعنایێکی خۆش ویستن و تەماعی و حەداسەتی تێدایە، هەر فەردێکی لەکوردا کەبیگری زۆر حەز ئە(تەسەلوت)و لەلێترسان دەکا، ئەمەش ئاشکرایە کەهەر کامێکیان دەستی بوو لەم ناحیەوە درێغی ناکات ئەم خود پەسەندییەی کەباسم کرد، ئەم رەوشتەی کەلەدەشتەکی هێناوەتە وجوود لەدەسەڵاتدارەکان بەغروور و غەدر بەدیار ئەکەوێ،



لەبێ دەستەڵاتەکانیش حەسادەتی پێبەخشیون، ئەم حەسادەتەی کەئەوانی هاویشتۆتە سەر تەبائیعی ئافرەت، لەعەلەیهی یەک دووان، عەیب بۆ یەکتر دیتنەوە، خۆرەپێش کردن وەلەرێگای ئەم خۆرەپێش کردنە ئەنواعی ناجائیزی کردن بەرامبەر بەدەسەڵات سەروماڵیان هین خۆیان نیە، بەرامبەر بە پیاوێک کەلێی بترسن وەیا ئەمەلی شتێکی لێ بکەن پیاوی زۆر سەخیو چاوتێرن، بۆ باقیتر قابیلی چروکو دەستقووچاون.

بەڵێ ئەم وەختەی کەمەلا هەمزەم لەگەڵ دائەنیشتو پێکەوە لەمەشاکیلی ژیان ئەدواین، ئەم هەموو حەقائیقانەی سەرەوەشم لەمێشکدا ئەهاتو ئەچوو، زۆر مەئیوسوو بێچارە ملم بۆ ئەم راستیە کەچ کردبوو بەڵام محاوەلەتی زۆر فاشیلیشم هەر دەکرد.

رۆژێکیان کابرایەکی هەولێری کەئاسنگەر بوو بەهۆی ئەوەی بەقەرز گاسنو ماسنی بۆ فەلاحەکان دروست کردبوو دەمەزەنی کردبۆوە، وەبۆ ئەمەی قەرزەکانی بەدەغڵ کۆبکاتەوە رووی کردبووە تیمار، تەبیعی هەموو لایەک زۆر حورمەتی وەستایان گرت وەستا پیاوێکی زەردەڵەی دەم قووچی رالەخۆبوو، ئەمەی ئەزانی کەئاغای ئەم گوندە سەعیدەو هەولێریە وەخۆشی هەولێریە، ئەم حاڵە غرورێکی بێ پەروای پێ بەخشیبوو، لەمەیانی قسەدا پێیان وت: وەستا خەتاب هەر پیاوە لەشوێنی خۆیدا چاوکراوەیە وەستا خەتابیش ئەهیناو ئەبردی وتی: "وەڵڵا کرمانج قەت عاقڵ نابنەوە هەر کەرن!!" ئەم وتارە منی تاساند مەجلیس قسمێکی وسکتو قسمێکیش بەعەسەبیەوە پێ ئەکەنی، مەلا هەمزەم هاتە پاڵ وتی "ئەگەر سەعید ئاغا دەنگ نەکا، من ئیمشەو بەزمێکی وا بەوەستا خەتاب دەکەم کەزۆری پێ پێبکەنین" جوابم دایەوە کەبەزمەکە بکاتو مەسئولیەت لەملە من بێ، مەلا هەمزە برایەکی هەبوو ناوی حەسەن بوو پۆلیس بوو بەسیلە هاتبۆوە ئەلبیسەی پۆلیسی لەگەڵ خۆیدا هێنابووە برایەکەی ئەلبیەی پۆلیسی لەبەر کردو سواری ماینێکیان کرد لەسەر بستەکەی دیار ماڵانەوە تفەنگێکی تەقاند بەتاو رووی کردە ئاوایی، وەخت شەو بوو مانگەشەوێک وەک رۆژ وابوو، ماڵی سەعید ساواریان ئەکوتایەوە، ئاوایی بەجارێک بەژنو پیاوەوە لەساواری ماڵی ئاغا وەرهاتبوون، کەحەسەن بەسواری لینگی دایە سەر ئاوایی کەم کەس حەسەنیان ئاسیەوە، بەڵام خێرا تێیانگەیەندرا کەدەنگ نەکەن، حەسەن بەعارەبی وتی: وەستا خەتابی ئاسنگەری هەولێری لێرەیە؟ ئێمەش وتمان بۆ؟ برایەکی ماڵی دزیاری لا ئاشکرابووە، لەسەر قسەی برایەکەی زۆرترینی ئەشیا لای وەستا خەتابە کەهێنایەتی لەدەشت بیانفرۆشێ، ئێمە مەقرەزەین لەبەیانیەوە بەهیلاک چووین، ئەم دێهاتانەمان ئەهێشت ئێستا لە (عەزە) وتیان کەئیمڕۆ هاتووتە تیمار باش چاوەشە ئەفەندی وا لەسەر رێگا راوەستاوە ئینتیزار ئەکا ئەبێ ئێستا تەسلیمم بکەن. ئەحمەد چوو جڵەوی ماینەکەی گرت وتی. فەرموو دابەزە چایێک بخۆرەوە - پۆلیس قۆنداغە تفەنگێکی لێدا وەستا خەتابیش خۆی لەپشت دوو زەلام ئاخنی بوو بەکوردێکی شکستی هەولێریانی ئەیووت "جوو بووم لەسەر دەستتان مسلمان بووم، تەسلیمی ئەم کافرەم ئەکەن، هەمن لەرێگا دەمکوژێتەوە" جوابی پۆلیسمان دایەوە کەوەستا خەتاب ئەهاتۆتە تیمار، لەم ئانەش وەستا خەتابیان بەدووسێ کەس برد چارۆکەیکی ئافرەتیان پێدادا لەگەڵ ئافرەتەکان هاویشتیانە بەر ساوار کوتانەوە، بەم چەشنە پۆلیسەکە دووسێ جاریتر هاتەوە هەر جارە بەجۆرێک لەمزگەوت یان لەسەربانەکەی جوریکی لەتەویلە، ئیتر بەم چەشنە نەیانهێشت تا بەیانی وەستا خەتاب لەترسی پۆلیس بنوێ، لەم مەیانە خۆی بەقوربانی هەمو شتێکی کرمانج ئەکرد، بەیانی زوو لەخەو هەڵسا بەرەو هەولێر گەڕایەوە ئێمەش مەحمودی پیاوی سەعیدمان لەگەڵ ناردو کاغەزێکمان بۆ کاکە سەعدی برام نووسی کەوا ئیشانی وەستا خەتاب بدات پۆلیس بەغەلەتی ملی ئەویان گرتووە، لەوسەر کەمەحموود گەڕایەوە،

وەستا خەتاب گلۆزێک جغارەی غازی بۆ مەلا هەمزەو ئەم کەسانە ناردبوو کەرزگاریان کردبوو، وە وتبووشی سەلام لەهەموو خزمەکان بکەن پێیان بڵێ مەراق نەکەن (الحمد للە) مەسئەلەکە درۆ بوو، هەر بەمەش ئیکتیفای نەکردبوو، بەڵکو بۆ شەو دەستەیکی مۆمیشی لەسەر قەبری (شێخ‌ئەللا) سوتاندبوو پاش سێ ساڵ زانیبوویەوە کەئەمە موئامەرە بوو، زۆر تووڕەو تنویندیشی خواردبوو کەئەمەیان لەسەر ناچێ؟!

ئەم حادیسە بەسیتە شتێکمان نیشان ئەدا کەدەشتەکی ئەگەر ترسیان ئەبێو (توجیە) بکرێن هەردەم بۆ موحافەزەی حقوقو کەرامەتی خۆیان فەعالترین دەبن.

گەڕامەوە هەولێر بۆ ئەمەی بچمەوە کۆیە لەپێش ئەوەی کەسەفەر بکەم حەفتەیەک لەهەولێر مامەوە، ئەو قوتابیانەی کەلەبەغدا ئەیانخوێند، هەموویان بەموناسەبەتی تەعتیل گەڕابوونەوە هەولێر، لەوانە (سەید فەتاح سەید عەزیز)ناوێک کەلە (دار العلوم) دەیخوێند زۆر ئەفکاری کوردەواری سەوری بەرپا ئەکرد بەو بۆنەی کەمن زۆر تینوی ئەو ئەفکارانە بووم خۆم لێی ئەزدیک دەکردەوە لەو تەئریخی کفاحی پۆلۆنیام وەرگرتو خوێندمەوە حەقیقەتو وەزعیەتی پۆلۆنیا زۆر بەوەزعیەتی کوردستانی حاڵی ئەچوو، میللەتێکی گەورەو بەمەزیەت وڵاتێکی بەرینو دەوڵەمەند بیوە (زەحیەی) سیاسەتی دراوسێیە بەقوەتەکانی سەدان هەوڵو تەقەلای سەربەستیان دا هەموو جارێک فەشەل بوون بەڵام ئەبەزین ئیسراریان لەسەر خەبات هەر کرد تا لەدواجارا موەفەق بوونو بەئاوات گەیشتن، دیسان هەر لەسەید فەتاح کتێبی (قضیة الكردیة)ی بلەج شێرکۆ دەستکەوت فەزایحاتی تورکیام خوێندەوە کەلەگەڵ کوردەکان کردبوویان بەڵام سەید فەتاح دیعایەی چەشنێکو تەکلیفی چەشنێکی‌تر بوو دیعایاتی سەوری دەکردو تەکلیفی دانانی جەمعیاتی تەعاونیو ئیقتسادی دەهێنایە بەرو هەردووکی بەبۆیاغی حەماسەت بۆ بۆیاغ دەکردم ئەمانە سەریان لێ شێواندم لەپێش ئەمەی کەبۆم ساغ بێتەوە مرازی چیە وەیا بەراستی بۆ چ چەشنە ئیشێک ئامادەیە چوومە کۆیە

لەکۆیە زۆر گیر ئەبووم چوومە (مەل زیاد) بۆ سەر توتنچار عوسمان ئەفەندی ئاوێک کەلەتورکیاوە بەخەبیری زراعی لەلایەن حکومەت جەلب کرابوو، لەپاشان ئیستیغنای لێ کرابوو ئەم عوسمان ئەفەندیە، لەسەر ئەساسی ئەمەی کەتوتنی سەیناغ تووتن بەبێ ئاو پەروەردەکردن دەکرد هاتبو مەلازیاد لە ئەرزێک توتنی داچاندبوو کەدەمزێو ئاوەزەن بوو، عوسمان ئەفەندی کوردی ئەدەزانی لەگەڵ مەلا زیادیەکان هەر بەئیشارەت قسەی دەکرد، بەشەو غرامەقوتی لێ ئەداو کرمانج گەل ئەدەوری کۆئەبووتەوە، بەرۆژیش ئیشی دەکرد بەم سوورەتە عوسمان ئەفەندی دەموسات مەشغوول بوو بەڵام عەسران ئەهاتە لای من قاوەی ئەخواردەوەو باسی خۆش خۆشمان بەدەم یاری (دۆمینەوە) لەگەڵ یەکتر ئەکرد، حەقیقەتەن من لەمنداڵیەوە هەندێک تورکیم ئەزانی وەلەگەورەیشدا بەموتالەعە ئیتلاعێکی زۆرم لەتورکی پەیداکرد، ئەم جارە بەهۆی عوسمان ئەفەندی تەمرینێکی باشم لەسەر بەتورکی دواندن کرد لەگەڵ ئەوا بەچاکی لەهجەم ئیستیقامەتی سەند وەختی تورکی لاتینی لەئەوەوە فێربووم، عوسمان ئەفەندی پیاوێکی کورتە باڵای قەڵەوی دەمو چاو خروکاری دەم بەپێکەنین بوو.

سالی١٩٣٦

مەکتەب کرایەوە کەئیکماڵی تەحسیلم بکەم مەجبوورمام کەبگەڕێمەوە هەولێر، گەڕامەوە هەولێر، بۆ کتێب کرین چوومە کەرکوک لەماڵی کاکەم حەمید دە رۆژ مامەوە، زۆر بەحورمەتو ئیتعای مەرامەوە گەڕامەوە، لەپێش ئەمەی کەدەستکەم بەزیکرەیاتی (ساڵی ١٩٣٦) بائەمەم لەفکر نەچێ کەمن لەم ساڵە لەعومری (١٨) ساڵیدا یەکەم جاربوو کەسینەمام دیوە، لەمەوپێش هەر



ناویم بیستووە، وە ئەو فلیمەی کەیەکەم جار دیم فلیمێکی ئینگلیزی بوو، چەتەیی‌و ئیجرامی تەمسیل دەکرد ناوی (Black eyes) بلاك ئایس بوو بەڵام لام زۆر غەریب نەبوو چونکە لە (مبادئ العلوم)دا لەقیسمی فیزیا سینەمامان خوێندبوو من ئەسراریم ئەزانی

-١-

حادیسەی موراقیبی عامی مەکتەب کە لە بەشی ساڵی ١٩٣٥دا بەیانم کرد بووە مایەی یەکێتی‌یەکی زۆر بەقووەت لەبەینی قوتابیە غەریبەکان‌و هەولێریەکان، هەروەکو باسم کرد بێجگە لەم حادیسەیەش ئێمە یەعنی قوتابیە غەریبەکان لەهەولێر هەر خۆشەویست بووین بەڵام ئەم حادیسەیە (بالذات) مەجالێکی تری داینێ کەبەرۆحێکی پڕ ئیعتیمادەوە لەگەڵ یەکتر هەڵبستین‌و دابنیشین. خورشید سەعید کەمودیری مەکتەبی متەوەسیتەی هەولێر بوو لەو ساڵەشدا ئەعرەی (...) پەروەری لەباو بوو وەبەراستی بەناوی ئەوەی کەقوتابیەکانی هەولێری لەعەرەبیدا زۆر زەعیفن وەئەبێ ئەمە چارەبکرێ‌وە ئەم چارەکردنەش بەدانانی لجنەی ئەدەب‌و خیتابە موباشەرە کرا، ئەم لجنەیە بە(نظارەتی) موعەلیمی ریازە داودە ئەفەندی ئیدارە ئەکرا وەهەرکەسی کەداخیلی ئەم لجنەیە بایە ئیمتیازێکی ئاشکرای ئەدراێ وەئەغلەب ئەعزایانی ئەم لجنەیەش منداڵەکانی مەئموورین بوون بەم هۆیەوە تەفرەقەیێکی زۆر لەسووئی ئیستعماڵی ئەم ئیمتیازانە کەوتە بەینی قوتابیان خاسەتەن ئەم ڕۆژەی کەحەفلەی یەکەمی ئەم لجنەیە هەر بۆ قوتابیەکان لەمەکتەب کراو لەم حەفلەیەدا مودیرو داود ئەفەندی هەردووکیان خوتبەیانداو، لەخوتبەکەیان ئەمەیان بەیان کرد کەهەرکەسێ بەجدی بۆ ترەقی ئەم لجنەیە تێ‌نەکۆشێ لەپێش چاوی ئیدارەدا سووك‌و موحتەمەلە لەدەرسەکانی سقووت بکا لەو ڕۆژەوە هەموو سبەینان کەئەچووینە مەکتەب لەسنفەکاندا لەسەر لەوحەی رەشدا جوملەی ناشیرین لەعەلەیهی کورد ئەنوسرا، بەرامبەر بەم ئەعمالانە شکایەت کردن زۆر فائیدەی ئەبوو، قوتابیە کوردەکانیش بەمەجبووری لەبن جوملەکانی وان جوابیان بەناشیرینی ئەنوسیەوە.. غەریب نیە کەئەم جوملانە لەسەر دیوارەکانیش نوسرابوون، بەڵام غەریب ئەمەبوو کەئیدارەی مەکتەب بەشیدەت تەحقیقاتی ئەکرد کەبگاتە جوابدەرەکان، تا ڕۆژێکیان مودیر وتی ئەگەر تا مودەیێکی کەم ئاشکرا ئەبێ کێ ئەم جوملانە ئەنووسی مەجبوورین کە (مەشبوهین هەموو تەرد بکەین) وە مەشبووهەکانیش ئاشکرا بوو کێنە، چونکە هەموو ڕۆژێك لەلایەن ئیدارە تەحقیقاتیان لەگەڵ دەکرا لەتیفە ئەمە بوو کەمەشبووهەکان هەموو کورد بوون ئەو ڕۆژەی کەموتەسەریفی تازە (ئەحمەد توفیق بەگ) زیارەتی مەکتەبی کردو بەکوردی چەند وتارێکی دا، ئەم وتارانەی موتەسەریف قوتابیە کوردەکانی لەهەست بەبێ‌کەسی کردن ڕزگارکرد، لەلایەکی تریشەوەش عەزمێکی بەقوەتی دانێ کەمقاوەمەت بکەن لەپاش هاتنی موتەسەریف‌و خوتبە خۆشەکەی لەجەریدەی (بلاد)دا چەند مەقالییێکمان خوێندەوە کەدیفاعی (عەلی کەمال بەگ)ی تێدا نووسرابوو، داوای تەتبیقی قانوونی لوغاتی مەحەلی دەکرد، سەدای خوتبەکانی عەلی کەمال دووبارەکی لەپاش سکووت کردنی کورد مودەی شەش ساڵ ئەم سکووتیەی شکاند، ئینجا لەسەر ئەساسێکی تازە لەبەغداوە ئیدیعائات دەستپێ کرا. لەهەولێریش کەقوتابیەکان ئاگایان لەهیچ نەبوو، موراقەبەیان خسترایە سەر بەراستی لەهەموو لایێکەوە تەزیق کراین، شورتە موراقەبەی ئەکردین، ئیدارەی مەکتەب عونفی ئیستعمال دەکرد، دیعایە لەعەلیهیمان زۆر بەقووەت ئیشی دەکرد ئێمە بەرامبەر ئەم هەموو عونفە لەپاش ئیجتماعێکی کەلەڕۆژی (٢٠)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٣٦) لەبەینی حەفت قوتابی کرا قەرار درا کە بەسوورەتی شکایەت ئەحوالی خۆمان‌و عونفی مەکتبە لەموتەسەریفی (لیواء)و ئەشرافەکانی لیوای هەولێر بنووسین، فیعلەن نووسرا وەرەوانە کرا. بەڵام بێجگە لەشتێك نەبێ چ نەتیجە مەحسوسمان نەکەوتە دەست ئەو شتەش ئەمە بوو کەلەزوبانی پیاوێکی گەورەوە بۆیان گێڕاینەوە کەبەسوورەتی واسری شتی وا حەیەوی نیشاندان زەرەرە. هەر کەسێکی کەئەمانەی نووسیوە وەیا هەر جەماعەتێك کەئەمەی کردووە بێن بەئاشکرای ئیدیعا بکەن ئێمە تاتاخیر ئەفەس لەگەڵیانین خێرا تێگەیشتین کەحکومەت بەرامبەر بەو نووسینانە زۆر مشەوەش بووە وەناشزانێ کێ‌یە، ئەیەوێ بەم سوورەتە ئیقاب لەسەر ئەم جەماعەتە لا بدات، تەبیعی ئەم نوسینانە کەوتە بەرچاوی هەموو کەسێکی لێوەشاوە بەڕاستی ئیستفادەیێکی زۆری لەلایەن ئینتیباهی قەومی‌یەوە بەخشی.

٢

لەم ساڵەدا بوو ئەمر درایە مەکتەبەکان کە قوتابیانی سنفی سێ‌یەم تەدریبی عەسکەری بکەن. خورشید سەعیدی مودیری ئیدعای فتوایەتی ئەکرد لە گەڵ تەلەبەکان ئەویش جلکی فتوەی لەبەرکردو ئەچوو بۆ تەدریب بۆ ئەمەی کە عەمەلیەت قوتابیەکان لەسەر حدیثی ((إخشوشنوا فإن الترف یزیل النعم) تەعلیم بدات موافەقەتی لە مدیریەتی مەعاریف وەرگرت گکە بەپێ یان مەکتەبی متوستیە سەفرەیێکی ناوچیا بکات وە بۆ ئەمەش (میر ئاخور ئینتخاب کرا).

***

**بەداخەوە لێرە کتوپڕ یاداشتەکە کۆتایی دێت‌و دڵدار لە نووسن دەوەستێ. ئەگەرچی بەشی هەرە گرنگی ژیانی دڵدار پاش ئەو قۆناغەوە دەست پێ دەکات، (رۆڤار) هەندێ زانیاری دەست کەوتووە کە بەشێك لەو دەستنووسانە ئێستا لای برایەکی ڕۆژنامەنووسە کە ئێستا لە هەولێر دادەنیشێ، هیواداریین لە نزیکترین فرسەت دا چاپیان بکات.**

**وە هۆی پچڕان‌و تەواو نەکردنی وەك مامۆستا مەجیدی برای دەڵێت:**

**((دوو دەفتەری تر یەکیان بە نووسنی من‌و گوتنی دڵدار ئەویتریان دڵدار بەدەستی خۆی نووسیبووی وە زۆر شتی بە نرخی ژیانی ئەوی تێدابوو نازانم چۆن.. وە کەی بزر بوون‌و لە دەستمان چوو؟**

**کە چی لە دوواجارا ئەو دەفتەرەی کە مزدکەراتم تێدا نووسیبۆوە گەلێ شتی بەقیمەتی تێدا بوو لێم وون بوو**

**نازانم کە کام دەست ئەم خەزێنە بەنرخەی لە دەست دام..)) سەرەڕای ئەوەش مەرگی ناوەخت ماوەی نەدا نەك هەر ئەوە تەواو بکات بەڵکو گەلێ بەرهەمی پڕ بەهاو ئاواتی تر بەجێ بێڵێ**

# بیرەوەری

مەسعود محەمەد

ساڵی "١٩٤١"ی زایینی کە لە کۆلیجی حقوق دەستم کرد بە خوێندن یەکێك بووم لە نێوان (١٠٠) قوتابی کە ئەو ساڵە قبول کران "٤" قوتابی دیکەش لە ساڵی ڕابردووەوە مابوونەوە، یەکێکیان "دڵدار" یونسی مەلا ڕەئوفە فەندی (خادم السجاد) بوو کەوا لەبەر ناساغی نەیتوانی بوو لە ئەزموونی کۆتایی ساڵدا بەشدار بێت لەیەکەم دیتندا زەردیو بێ هێزی ئەو ناساغیەییم لێ ڕەچاو کرد دواتریش کەمە کەمە ئاشنای باری ژیانی بووم

ساڵ یەکەمی خوێندنمان بەیەکەوە هەر بایی ئەوە کەدوو قوتابی کوردینو خەڵقی یەك شارین بەرەو یەکتری دەکردینەوە، پێوەندی ناو کۆیی و هاوڕێیەتیمان لەوەی تێپەڕ نەدەکرد کە ڕێز لەیەکدی بنێینو لە گیرو گرفتی دەرسەکان پرس بەیکدی بکەینو لە ڕێکەوتی دەوری مێزی چێشتخانەیەکدا پێشدەستی ئەسرەف بەملەوە گرتن بۆ یەکدی بکەین. لە ڕابووردوودا وەها لە یەکدی نزیك نەبووین کە بەیەکەوە خوێندنمان لە بەغدا ببێتە قۆناغی چەسپاندنی برادەریەکی کۆن. بەڕاستی هەردووکمان خەریك بووین، بە خامۆشی لەنوێوە تانو پۆی برایەتی بتەنین

دڵدار قوتابییەکی دڵ زیندووی هۆشیاری مێشك کراوەبوو. ڕەنگە گومان لەوەدا نەبێ کە لەمپەری "لاڵی" لە بەرایی ئاخاوتنیدا، وەك بناوانێکی پەنگاو بە ناو بداتەوە، هەموو گوتە نەبێژراوەکانیو بیروباوەڕە ئاشکرا نەکراوەکانیو هەستو سرکەو کورکە خەفەبووەکانی دابێتەوە دەروونیو لەناخی گیانیو هۆشی ون بووبێتەوە ئەو بژێوە مەعنەوییەی جارەهای جار بەدەم ورووژانی عاتیفیەوە وەك تاڤگە هەڵدەڕژا. لەو بارانەدا کە هێزی خەفەکردنی ئاخاوتنی ڕەها دەبوو تۆڵەی ئەو جارانەشی بۆ دەستاندەوە کە بەزەحمەت مامڵەتی پاکەتە جگەرەیەکی تێدا دەکرد.

ڕێبازی ژیانی ساڵی یەکەممان لە حقوق بەدراوسێیەتی برادەرانە گەیاندینیە پشووی هاوینە، بێ ئەوەی تێکەڵ بەیەکدی ببنەوە لەو ساڵەدا خوالێخۆشبوان کاکە حەمەی خانەقاو عومەر عوسمانو من، ناوی "الفرسان الثلاثە"مان پێ ڕەوا دیترابوو.. هەرسێکمان لە کۆلیجو دەرەوەی کۆلیج هەمیشە بەیەکەوە بووین تا ئەگەرمنی ویستبایە دەیتوانی بەدوای عومەردا بگەڕێتو بمدۆزێتەوە بەداخەوە عومەر هەر ی٣ ساڵەدا دووچاری ناساغییەك بوو کە دەرفەتی پێنەدا نیوەی خوێندنی حقوق تەواو بکاتو زۆریشی مۆڵەت نەدا جوانە مەرگی کرد. ماینەوە کاکە حەمەو من.. دڵداریش بەرە بەرە لێم نزیکتر دەبۆوە، وەك کە لەگەڵ کاکە حەمە پێشتر برادەرییان ڕەگو ڕیشەیەکی داکوتابوو. لە باری گوزەرانەوە دڵدار ساڵی یەکەمی بە پۆشتەیی بردە سەر، لە برایەکی گەورەتریەوە کە لەناوچەی ناوەندی عێراق مووچە خۆری حکومەت بوو، خەرجییەکی تێرو تەسەلی بۆ دەهات ئەوساش هێشتا جەنگی دووەم تەنگی بە ئابووریو نرخی پارەی مووچەخۆران هەڵنەچنی بوو کە دەستیان لە یارمەتی کەسو برا کۆتا بکات بەلام بە حاڵ ساڵ چووە سەر کە براکەی دەستی لە ئیش کێشایەوەو دڵدار کەوتە سەغڵەتی گوزەرانەوە. ئەوەی لێرەدا پێویستە بۆ باس کردن، ئیزن لە گیانی دڵدار بخوازمەوە، جوامێرێکی بەرەیەکی نیشتمانپەروەری کۆیی بوو کە بەسەر حاڵو باری وەك هی دڵدار ڕادەگەیشتو بەلای کەمەوە لەسێ بەشی خەرجی بەڕێوەچوون دوو بەشیان جێ بەجێ دەکرد بێ ئەوەی هەستێکی تێدا بریندار ببێ بەپێچەوانە لە خانەی حورمەتو بەرەو پیری ئەو کارەوە دەچوون، تەنانەت دوای مەرگی باوکم لە "١٩٤٣" هەمان دەستی یارمەتی بۆ منیش درێژکرا بەلام من ئەو پێویستیەم نەبوو کە ببمە هاوبەشی ئەوانەی دەستیان تەنك بوو. لە ساڵی دووەمی خوێندنمانەوە پێوەندی نێوانمان بەرەو پتەوتریەوە ڕۆییو لە چەندو چۆنی یەکتر شارەزاتر بووین، هەندێ خەسڵەتی دڵدارم لەو ساڵەدا بۆ روون بۆوە، تێ گەیشتم دڵدار گەنجێکی ئازایە، پڕبەپێستی وشەی ئازایش ئازایە. جارێ لە لایەن ئەوەی کوردی پێ‌ی دەڵێ "ماڵی دنیا" دڵدار فلسێكو دینارێکی بەلاوە یەك شت بوو. دەیتوانی چی خوا پێی داوەو پێی نەداوە بە قوربانی نیازێکی بچووکی برادەرەکەی بکات، پەندی عەرەبی کە دەڵێ "اصرف ما في الجيب يأتك ما في الغيب" بە قاڵبی دڵدار داڕژابوو، هەژاریەکی کە خۆی لەبارەی خۆیەوە باسی دەکات لە جیاتی لێ گرتنەوەی خەرج کردن بووبوە هۆی دەست بڵاویو گاڵتە بە هەبوونیو نەبوونی کردن. دەست کورتی بایی تۆزقاڵێك عەزمی نەشکاندبوو چونکە ئازاییەکەی لەتێشکانی هەژاریەکەی پتری بۆ تێ دەهێنایەوە. نەمدیت ڕۆژێك لە ڕۆژان دڵدار قسە قوت بداتەوە وەیا لە هەڵوەست دابەزێ بە مەرایی کردن بەرانبەر ئەوازشتو یارمەتی ئەمو ئەو هەر ئازایەتییەکەشی بوو بە سەر تێوەمانی ئەداریدا زاڵی کردبوو تا ئەوەی حیسابی دەست کورتی لە ڕوو پەڕەی کرداری دڵداردا سڕابۆوە. هەروەك ڕیخۆڵە کوێرە بە کەسەوەدیار نی‌یە ئەدارییش بە کردەوەی دڵدارەوە دیار نەبوو، لە کەسیشەوە هەستنەدەکرا دڵدار بە دەست کورت دابنێ، هەر لە ئازایەتیشەوە بەسەر گیرو گرفتی زمانیدا بەرەو ئەو کارانەوە دەڕۆیشت کەوا پەکیان لەسەر زمانی پاراو کەوتبێ وەك کە یەکێك بوو لە چالاکترین ئەندامانی پارتی هیواو گەرمترین دەمەتەقەی بەدەوری کردەوەو ڕەفتاری ئەو حیزبەو ئەندامەکانی بەرپادەکرد، ئینجا نوکتەشی لە خۆیو برادەرە لاڵەکانی وەك خۆی دەگرت. جارێکیان برادەرێکی هەردووکمان کە ئەویش لاڵ بوو پێمان گەیشتو ڕووی لە دڵدار کرد گوتی (ها.. لاڵە پەتە..) دڵدار قسەکەی لێ قۆستەوە گورج گوتی (ها.. قەل بە قەل دەڵێ ڕووت ڕەش بێ..)



یەکەم لە لای ڕاست دڵدارە

## دڵدار مرۆڤێکی ئازا بوو..

لە پۆلی دووەمی حقوق دڵدار دەرگەیەکی بەڕوومدا کردەوە، دواتر بوو بە کولانەیەك بۆ ناو دەروون و دڵ و ویژدانی خۆی؛ بردمی بۆ سلاوخانەی "بهیە فرج الله الکردی"

ئەم خاتوونە کیژی "فرج الله الکردی" بوو کە لە میسر بە برادەرایەتی و هاوڕێیی و پشت گیری "محمد علی عونی" کتێبی شەرەفنامەی بە چاپ گەیاند.. بەهیە، دوای مەرگی باوکی بە خۆی و دایکی هاتنە عێراق و لە قوتابخانەیەکی بەرزی کچان دەرسی دەگوتەوە، لە ڕادیۆش گووتارو سەر گورشتەی بۆ ئافرەت و منداڵان دەگێڕایەوە. لە حورمەتی باوکی لای کورد، پشکێکی گەورە بۆ ئەو کیژە مابۆوە لێ هاتویی خۆیشی وەهای کرد سلاوخانەکەی لە "اعظمیة" شێوەی سالۆنی "می زیادە"ی قاهیرە وەربگرێ، فرج الله ئاشنایی لە گەڵ باوکم دا هەبوو، چەند نامەیەکەیش بۆ باوکم یادگاری ئەو ئاشنایی‌یە بوو لێی بەجێ مابوو، کاتی خۆی کە "شەرەفنامە"ی بلاوکردەوە چەند دانەیەکی لێ نارد بۆلای باوکم.. ئەم پێوەندییە کۆنینەیە ڕێ خۆش کەرەیەکی دروست بوو بۆ ئەوەی بەهیە بەخێرهاتنێکی گەرم و گوڕم لێ بکات. فرج الله بەخێزانەوە بەهایی بوون.. بەر لەوەی من ببمە ئاسیاوی بەهیە، دڵدار چەند جاران لە بارەی دینی بەهایی لەگەڵ پێشەواکانی مەحفەلی بەهایی بەغدا هەر لە لەماڵی بەهیە، وتووێژو گفتوگۆی کردبوو، هەندێ تێبینیشی لە باوەڕی بەهایی لێ وەرگرتبوون.. شەوانی ڕۆژەك لە ڕۆژەکانی هەفتەدا سلاوخانەی ماڵی بەهیە پێشوازی لە میوانان دەکردو چەندین سەعات مەجلیسی ئەدەب و نوکتەو قسەی ڕێك و پێك بەردەوام دەبوو.. بەزۆری دڵدارو من، ئاوناوەش لە گەڵ کاکە حەمەی خانەقادا بەیەکەوە دەچووین بۆ لای بەهیە، دەبوو لە ڕۆژی تایبەتیدا بێ مێوان و بێ کۆبوونەوە سەرمان لێی دەدا هەندێ جار هەر لای ئەو نیوەڕۆژمان دەخوارد، بەهیە لە گەڵ دایکی بەفارسی دەدوا چونکە کوردیان نەدەزانی هەرچەندە گیانی کوردایەتیان زۆر پێوە دیار بوو بە عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسی و فارسی جوانترین شێوە ئاخاوتنی هەبوو وابزانم دڵی زۆر کەسی بۆ چووبوو بەڵام تائەوەندە من بزانم دڵی ئەو بۆ کوڕە دەوڵەمەندێکی سلێمانی کە برادەرم بوو یەك دوو ساڵێك دوای پۆلی من بوو لە حقووق، لێی دەدا هەرچەند ئەو کوڕەش بەهیەی خۆش دەویست چارەنووس لێکی ترازاندن.. لە بەهیەم بیستوە دەیگوت، ئاواتمە شوو بە گەنجێکی کورد بکەم و بمباتە دێیەکی کوردستان و ڕێم پێ بدا خزمەتی ئافرەتی کورد بکەم. دڵداریش ئەمەی لێ بیستووە ڕەنگە گەنجی دیکەش گوێ بیستی بووبن. بۆمن بەهیە خوشکێکی بەڕێز بوو کە ئیتر پێشنیازی ئەوتۆیی لای من دەنگ نەداتەوە. ئەوساش جارێ ئەو برادەرەمی نەدیتبوو کە دواتر دڵی بۆی چوو، ئیتر نازانم بۆچی ئەو ئاواتەی نەگەیشتە جێ. لەوسانەدا کەساڵی دووەمی خوێندنم بوو لە حقوق هەستم نەدەکرد کە دڵدار لەناوەوە بۆ بەهیە دەسووتێ ساڵی سێیەم و چوارەمی خوێندمان کە (٩٤٣-٩٤٤)و (٩٤٤-٩٤٥) دەگرێتەوە دڵدارو من لەیەك ژووری ئوتێلی "ڕشید"ی گەڕەکی "سید سلطان علی" مان بەسەر برد. لەو دوو ساڵەی خوێندندا بەیەکەوە ژیانمان هەموو ئەو ڕووپەڕە دەروونیە شرایەوەی کە بشێ بۆ بەرچاوی برادەر بکرێتەوە، بۆ یەکترمان کردەوە. بەڵام لە گۆشەی حەزو دڵدارییەوە باسی بەهیەم هەرگیز لە دڵدا نەپرسی چونکە دەمزانی حەز لێ کردێنێکی یەك لاییەو بۆ ئەو بەسفت و سۆیە. دەبێ لێرەدا بە خوێنەر ڕابگەیەنم کە دڵدارو من لە ماوەی "٤" ساڵی خوێندنماندا ڕۆژەك لە ڕۆژان و لە هیچ ڕێکەوتێك و ڕووداوێك هەڵوەستێکدا بەهیچ جۆرێك دڵی یەکتریمان نەئێشاندوەو هەرگیزاو هەرگیز لە پلەی ڕێز لێ گرتن بۆ یەکتر دانەبەزیوین. دڵدار ڕاستی لەو ساڵانەدا هاوڕێیەکی نموونەیی بوو. سەر لەنوێ، دوای دابڕانی جوانە مەرگ عومەر عوسمان کاکە حەمەو دڵدارو من ناوی (الفرسان الثلاثة)مان پێ درا چونکە بە زۆری بەیەکەوە دەدیتراین تەنانەت جارێکیان برادەرێك بانگی کردم بۆ ماڵەوە گوتی "جگە لە کاکە حەمەو یوونس کێی دیکەت دەوێ بانگی بکەم..)

دووەمیان ئەوەبوو حیسابی بۆ خەون دەکرد. هەر لەبیرمە ماوەیەکی کورت بەر لە ئەزموونی ساڵی چوارەممان، سبەینەیەکیان دڵدار خەونی بۆ گێڕامەوە گوتی لە خەوما تۆو من، بێ کاکە حەمە، دەڕۆیشتین تۆ لە پێشەوە منیش لەدواتەوە تا گەیشتینە کۆسپێك تۆ بێ زەحمەت لێی سەرکەوتیت و بەرەو پێش چوویت منیش لە کۆسپەکە کەوتم و هەڵسامەوە بەدواتدا هاتم.. گوتی لێم سوورە تۆ دەردەچیت و منیش ئیکمال دەبم و دەردەچم کاکە حەمەش، ڕەنگە ئیمساڵ بمێنێتەوە.

ئاکامیش وەها دەرچوو، دڵدار لەو دوو ساڵەدا دەروونی ئاوس بوو بە عیشقی بەهیە بێ ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان بیدرکێنێ خۆشیویستووە. هەر ئەو خۆگیرییەی بوو لێ نەگەڕا بپرسم ئەرێ دڵدار تۆ کە ئەم کیژەت خۆش دەوێت، ئەویش بەئاشکرا دەیەوێ شوو بە گەنجێکی کورد بکات ڕێی بداتێ خزمەتی ئافرەتی دەشتەکی بکات، گوندیشتان هەیە بەسەر ژنی تەقتەقەوە ئەگەر داهاتیشی کەم بێ خۆ ئافرەتی زۆرە ئیتر بۆچی نایخوازیت؟! کەم و زۆر دەرفەتی ئەم پرسیارەم لێی‌چنگ نەکەوت. دەشێ ئەویش چاوەنۆڕی دەرفەتێکی لەمنەوە کردبێت و چەنگی نەکەوتبێت تاکو دەردی دڵی بلێتەوە. وەك دەزانم لای کاکە حەمەش هیچی لەم بارەیەوە نەدرکاندووە بەداخەوە ئاگرەکەی وەك ژیلەمۆی ژێر خۆڵەمێش خۆی دەخواردەوە، گەرماییشی هەر ئەوەندە دەدایەوە کە لەهەندێ پارچە هەڵبەستی بەدیاری دەدا. یەکێك لەوان "خەندەکەی بایی"؛ ئەوانەی بەشیعرو بەسەرهاتی دڵدارەوە خەریکن دڵنیا بن لەوەدا کە فریشتەی ناو (خەندەکەی بایی) بەهیە فەرەجوڵلایە. لە نووسینی دیکەمداگوتوومە ژان و ژواری هەناوی دڵدار بەو مەلۆتکە شیعرە لەو دەمانەدا بوو کە بەیەکەوە لە ژوورێکی ئوتێلی ڕەشیدی بەغدامان بەسەر دەبرد، وا لێرەدا زەرفی ئەو بوحرانەشم باس کرد کە عاتیفەی تێدا تەقیەوە. ڕاستیەکەی دڵدار بۆ ماوەی یەك دوو هەفتە بەدەست ئەو هەڵبەستەوە وەك ئیوە سەرخۆش وەیا ئیوە مەدهۆش بەتەواوی نەیدەزانی چۆن و چی دەکات، هەمیشە چاوەکانی دەبڕیە دیمەنێکی خەیاڵی تەنانەت لە ڕۆیشتندا کەمتر ئاگاداری بەرهەنگاوەکانی بوو.

بەسەر خواردنەوە لە لۆقەنتە ڕادەما.. هێندێ جار قسەم بۆ دووپات دەکردەوە ئینجا تێم دەگەیی.. چەندێکیش لەو هەڵبەستە هۆنیبایەوە بۆمی دەخوێندەوە. وا دەبوو بەدوا ووشەیەکدا دەگەڕاو پرسی پێ دەکردم. لە شوێنێکی دیکەدا نوسیوتم کە لەبری ووشەی "چەپك" بۆ ووشەیەکی لێ پرسیم کە یەك تاڵ نەك چەپك ببەخشێت بەداخەوە ئەوسا نەمتوانی یارمەتی بدەم.. دڵدار لە هیچ هەڵبەستێکدا هێندەی "خەندەکەی بایی" زۆرەملێی لەگەڵ عاتیفەو شاعیریەتی خۆی نەکردوە هیچ پەری و فریشتە ئادەمیەکیش بایی ئەو هەڵبەستە ئارایشی لە دڵدارەوە بۆ نەچووە..

لەلایەن فکرەو فەلسەفەی سەر بە کۆمەڵایەتییەوە، دڵدار، لەوساڵانەدا بەلای تەقدیسی تاکە بێ‌مانەندەکانەوە دەچوو تا ئەوەی جارێکیان لەوتووێژدا پێمی گوت گەل وەکو ئەو ئۆتۆمبیلەیەکە بێ لێخوڕ نابزوێت لەوەرامدا پێم گوتەوە گەل ئەگەر کەسیشی سەرۆك نەبێت بە گوزەرانەوە هەر خەریك دەبێت.. بەجۆرێ لە جۆران دەجوولێت.. ڕادەبوێرێت.. زاوزێ دەکات.. ڕاووڕووتێك دەکات، لێمی نەسەلماندو هەر لەو قسانەدا چۆوە بۆ باوەڕی کارلایل و کتێبەکەی کە لە عەرەبیدا بەسەرە ناوی (الابطال) تەرجەمە کراوە.

فکری خەستی قەومایەتی دڵدار کە لەسروودی (ئەی ڕەقیب)دا دەردەکەوێت و وێنەیەکیشی ویژدانی کۆمەڵایەتی ئەوسایەتی، لەووتوێژا خەستترو باڵاوتەتر ڕابەر پەرست خۆی دەنواند.. دڵدار لە ئاست هەژاریدا دوو هەڵوەستی پێەوانەی هەبوو. یەکیان ئەوەبوو کەوا نەك هەر شەرمی لێ نەدەهاتەوە بگرە گاڵتەشی پێ‌دەکرد وەك کە گاڵتەی بە سامانی ساماندارێش دەکرد. دووەمیان ئەوەبوو کە لە خۆوە دەستی بۆ کەس پان نەدەکردەوە تا ئەگەر لە برسانیش مردبایە ئەوەبوو کە لە خۆوە دەستی بۆ کەس پان نەدەکردەوە تا ئەگەر لە برسانیش مردبایە. بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم خەیاڵەیان ڕووداو دەگێڕمەوە. دوو ساڵی بەیەکەوەژیانمان هەموو پەردەیەکی بێگانەتی

لەنێوانماندا هەڵگرتبوو تا
ئەوەی دەتوانم بڵێم
کیسە جوداییمان
نەما بوو. کاکە
حەمەی
خانەقاش
بۆ



دڵدار هەروەها بوو. لەگەل
ئەمەشدا ڕۆژەك لە ڕۆژان
دڵدار داوای فلسێکی لێ
نەکردووین.. بەڵێ بەیەکەوە
دەژیاین و دەمانخواردو
دەچووینە گەڕان بەلام
وەهابووە شەوو ڕۆژێك لە
یەکدی دابڕاوین بەهۆی

خەریك بوونی دڵدار بە حیزبایەتیەوە، ئینجا کە ڕۆژی دوایی بەدەوری مێزی چێشتخانەوە کۆبوینەتەوە تێی گەیاندووین کە لەدوێنێوە هیچی نەخواردووە چونکە دواین فلسی لە پێرێوە خەرج کردوە. بەکەسیشی نەگوتووە برسیەیتی پارەشی پێ نیە. لەو بارانەدا گلەیی دنیاو قیامەتمان لێ دەکرد لەوەدا کە بۆچی پێشتر دەنگی نەکردووە خۆ ئێمە ماڵمان کاول نەبوو بوو بەلام هەرگیز نەمانهێنا سەر ئەوە بارەی لە خۆوە ئیعلانی ئیفلاسیمان بۆ بکات.

لە کۆتایی ساڵی چوارەمی خوێندنم ناچار بووم بۆ ماوەی (٢٠) ڕۆژێك بچمە ئوتێلێکی دیکەو لە ژوورێکدا تەنها بیم بەڵکو بتوانم ئەختێك خێرایی لە خوێندنەوەی دەرسەکانم بکەم کە بە درێژایی ساڵ بۆم نەکرا بوو سەریان پێدا بگرم (ئێرە جێی باسی ئەو هۆیانەی تێدا نابێتەوە کە لە ئەوساڵە منیان لە خوێندن تەنبەل کرد).

کاکە حەمەش هەر لەو ئوتێلە ژووری گرتبوو ئیتر ڕۆژێ هەرسێکمان بەیەکەوە دەبووین شەویش هەر وەها تادەمی نووستن. ڕۆژانی ئیمتحان دڵدار لامان دەبوو تا دوای نیوەشەو، سبەینانیش دەهاتەوە لامان و بەیەکەوە بەتاکی دەچووین بۆ کۆلیج. سبەینەیەکیان دڵدار دەرنەکەوت. چاوەنۆڕی بووین تا ئەگەر چی دیکە وەخرابابین نەگەینە ئیمتحان.. چوینە کۆلیج. لەو دەمەدا کە زیلی چوونە ژوورەوەی لێ دەدا، دڵدار پەیدا نەبوو.. کاغەزی پرسیارەکان بەسەر قوتابییاندا دابەش دەکرا ئینجا دڵدار بەهەناسە سواری هاتە ژوورەوە.. پاش ئەزموون لێمان پرسی بۆ وەها خرا؟ گوتی لە ڕۆژان درەنگتر خەبەرم بۆوە ڕام کرد بۆ ئوتێلەکەتان دەرچووبوون.. پارەی پاسم نەبوو بە پێیان کوتام.. بەڕاستی خەریك بوو لێی دەین: هەی ماڵت شێوێ تۆ شەو تا دوای سەعات (١٢) لامان بوویت.. بەیەکەوە لەوەڕاین.. کاکە حەمە پێی گوت ئۆغرت بەخێر نەبێ بۆ شەوێ نەتگوت دینارێکی خوێرێو سەد فلسی بێ نامووسم دەنێ هیچم پێ نییە، بەر لەو جارە هێشتا لەگەڵ یوونس بووم نزیکی مانگێکی مابوو بۆ ئیمتحان عەسرێکیان هاتەوە ئوتێل گوتی من لە ئیمتحان قبول ناکرێم ! منیش لە جێگەدا بووم ڕاست بوومەوە سەبەبم پرسی، گوتی دووقستی (اجور مدرسی) قەرزدارم ئیعلانیش کراوە ئەوەی قەرزدار بێ ڕێی پێ نادرێ بچێتە ژووری ئیمتحان منیش ئەو پارەیەم نییە- گوتم کاکە یونس ئەگەر من لە جێگەی تۆ بامایەو تۆ لە جێگەی من چیت بۆ دەکردم؟ گووتی: باخەڵبڕیشم بۆ کردبایت پارەکەم بۆ پەیدا دەکردیت.. گوتم ئینجا بۆچی هێندە خۆت لە برادەری خۆت پیاوتر دەزانیت؟ پارەکەم بۆ پەیدا کرد بزەیەکی هاتێ.. پرسیم چیتەوە؟ گوتی چاوم فڕیوە ئەم پارەیەش بایی فرینەکە ناکات چونکە پارەکە بۆ خۆم نییە، بەرێکەوت نزیکی ڕۆژئاوا هاتمە جادە خاڵوانم لە ڕانیەو پشدەرەوە هاتبوون بە عادەتی خۆیان خەرجییەکی تێرو پڕیان دامێ کە زۆرم لێ زیادبوو.. گەڕامەوە ئوتێل گوتم کاکە یونس پارەی ئەو دوو قیستەو حەقی چاو فڕینیشت لە منەتدا نەما.. خوا زۆری ناردوە.. چەند گەشو پاك بوون ئەو ڕۆژانە!!!

دڵدار لە برادەریدا سنووری نەدەهێشتەوە: بەڵێ ڕاستە لەخۆوە داوای یارمەتی نەدەکرد بەلام لەو پەڕی جوانمەردیدا ئەو بێ فەرقیەی دەکرد کە ئەگەر لێت وەرگرتبایە منەتبار نەبیت ئەگەر لێشی وەرگتبایت وەها بزانیت بە خۆتت داوە. شەخسیەتی خۆیشی ژووری ناچاریو بێ گوزەرانیەوە دەگرت لەو ڕووەوە کە هەبوون و نەبوونی لە هەموو حیسابێکی (ڕەفتارو گوفتار) دەرهاویشتبوو، تاکو جارێکیان هاتەوە ئوتێل قاپووتێکی لەبەر بوو کە دەمی بەیانی دەچوو لە ئوتێل نەیبوو.. لێم پرسی ئەمەت لەکوێوە؟ گوتی ئەمە قاپووتی فلانە جوانە مەرگە براکەی ئەمڕۆ بۆمی هێنا، دەیزانی پێم دەوێ.. ئەو (برا)یەی دڵدار ناوی هێنا دۆستی ئەویش و منیش بوو بەر لە دوو ساڵێك برایەکی لە خۆ گەورەتری کە ئەویش قوتابی حقوق بوو جوانە مەرگ بووبوو.. دڵدار ئەگەر حیسابێکی بۆ نوێیو کۆنی جلك وە یا بەرماوەی زیندوو مردوو کردبایە قاپووتەکەی لەبەر نەدەکرد، بەڵگەش ئەوەیە کەبێ دوو

دڵی کردن چۆنیەتیەکەی بۆ گێڕامەوە وەك ئەوەی بڵێ لە (سوق الهرج) بە دینارێکم کڕیوە.. بەلای ئەوەوە بوونی دۆستایەتی و نەبوونی منەتباری تەنها شتێکە لەو تەرزە بارەدا حیسابی بۆ بکرێ. ڕاستیشی بۆ چوو بوو هەرچەندە ڕەنگ بوو من هێندەی ئەو ئاوا نەبم و شەرمی بێ جێ و بێ لزوم بمگرێ.. ئەم تەرزە خەسڵەتە لە دڵداردا شیرینتری دەکرد چونکە لە تروکەیەکی چاودا ماوەیەکی بەرەو ئاشنایی و برایەتی دەبڕی کە کوردە غیرەتی بەدوو ساڵ نایبڕێ. وابزانم لە قووڵایی دڵیدا هەستی ئامادەبوون بۆ خۆ لەبیرکردن لە پێناو برادەر هەمیشە دەیهێنا سەر ئەو باوەڕە کەڕەت کردنەوەی یارمەتی برادەر دەکێشێتەوە بۆ گومان لە خۆ کردن و بەخۆدا ڕانەپەڕموون لە مەیدانی تۆڵە بۆ کردنەوەدا: دڵدارێك هیچی لە برادەر چاو نەبێ بۆچی کۆمە بکات لە چاکەی برادەر؟ بۆچی ڕێی دڵسۆزی لە برادەر ببەستێ؟ دەزانم، لەو دەمەدا کە هەی بوو قوتابیەکی پۆلی خۆی کەوا تازە بەتازە یەکدی دەبینن و بەحاڵ ناوی یەکدی دەناسن، لە سەغڵەتیدا داوای پارەی لێکردبوو. دڵدار چاکەتەکەی لە ژوورەوە بو خۆیشی لە سالۆنی ئوتێل دانیشتبوو، بەو قوتابیەی گوتووبو زەحمەت نەبێ بچۆ ژوورەکەم و سەیری گیرفانەکانم بکە.. چەندی هەیە دەتوانیت بیبەیت. ئەو قوتابیە کە خۆشی جوانەمەرد بوو لەو ڕۆژەوە بوو بەبرادەری گیانی دڵدار، دواتریش بوو بەبرادەری من تا ئێستاش هەر برادەرین. من کە ئەم ڕووداوە بچووکانە لە دڵدارەوە بۆ خوێنەر دەگێڕمەوە دەمەوێ لەڕێی واقیعەوە نەك باوەڕی شەخسی یادی دڵدار بێ زیادو کەم هەناسە هەڵێنێ، ئەوساش گوزەران وەك ئێستا نەبوو حیسابی بۆ نەکرێ، هەژاریش ئەو دەردە نەبوو بە ئاسانی چارە بکرێ، دڵدار کە داوای لێ کرا، لە کوشندەی دەست کورتیدا کچێکی (زەهاوی) فێری کوردی بکات و تەکلیفەکەی هەڵگرتەوەو پاداشتەکەی ڕەت کردەوە (واتە بێ پارە ڕۆژانە دەرسی بەو کچە دەگوتەوە هەرچەندە کچەکە زۆریشی هەوڵدا خزمەتێکی لێ بسەلمێنێ) دەبێ حیسابی ئەوەی بۆ بکەین کە مامۆستایەکی ئیمڕۆ کە لەگەڵ مانگانەی تێرو تەسەلیشدا لە بری هەر دەرسێکی خارجی کە دەیڵێتەوە (١٠) دینار (٢٠) دینار (٣٠) دیناریش وەردەگرێ.. کوردی دەڵێ: هەر کەس گوێز لە هەنبانەی خۆیدا دەبژێری، منیش دەمەوێ گوێزی دڵدار بە وەکالەتی ئەو، لە هەنبانەی خۆیدا بژمێرم نەك لە خەرمانی تێکڕای گوێزی عالەم. بارەها لەگەڵ خۆمدا لێکدانەوەی ئەوەم کردوە ئایا ئەگەر من لە وەزعی دڵداردا بوومایە خوێندنم بۆتەواو دەکرا؟ تەنگانەو دەستکورتی و لەمپەری زمان و بێ ئومێدی لە ڕەوینەوەی ئەو دوو گرفتە زلە کۆلیان لێ دەدام بایی سەر بەکتێب داگرتن و تێگەیشتنی؟ ئایا دەمتوانی شەو ڕۆژێك ئان نەخۆم و قوتابیش بم؟ دەموێرا بە زمانی لاڵەوە ڕوو بەڕووی جەمیوەرەی بینەران و گوێ گران وەرگەڕێمە خوتبەی سەرپێیی یەك سەعاتی؟ هەڵبەستم بۆ دەهات؟ نەخێرو سەد جار نەخێر. لەدوای مەرگی باوکم کە گەڕامەوە بۆ بەغدا لەبیرەوەری (٤٠) ڕۆژەی مردنی‌دا ئاهەنگێکی تازیەمان بۆگەڕا لەیانەی سەرکەوتن.. نۆرەی دڵدار هات گوتارەکەی بخوێنێتەوە چەند دێڕێکی لێ خوێندەوە زمانی گیرا.. ویستی بە تانووت لە خۆدان زمانەکەی بەگەڕ بهێنێتەوە، بۆی نەکرا.. لەسەرەخۆ کاغەزەکانی پێچایەوەو بە ڕەوانی و بێ‌گرفت عوزر خوازی لە خەڵقەکە کردو گوتی نەخۆشی زمانیم هەیە وا ئێستا گرتمیەوەو لێ ناگەڕێ گوتارەکەم بخوێنمەوە ببەخشن.

گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی‌لێی دانیشتبوو بێ ئەوەی کەس هەستی بەخۆداشکانەوەی لێ بکات وە یا و تیێ مانەی لێ بەسەر بگرێتەوە. لەلای خۆمەوە زاڵ بوونی دڵدار لەو دەمەدا بەسەر شەرم و بەخۆدا شکانەوەی زمان نەگەڕانی دەمی گوتاری خوێندنەوەی نێ ؟بونەوەیەکی ئەو تۆیی‌دا گەلێك ئازایانەو ئازادانەترە لە خوێندنەوەی لووس و لێك و بەتین و تەوژمی گوتاری نیو سەعاتی و دوو سەعاتی لەو دەمەدا من لە جیاتی دڵدار موچڕکم پێدا دەهات دەزانم دڵدار دەیتوانی بێ نووسینەوە لە موناسەبەیەکدا بدوێت و زمانیشی نەگیرێ بەڵام بەلای کەمەوە دووتێبینی خستیە سەر پەسەندکردنی گوتار ئامادەکردن: تێبینی یەکەم ئەوەیە کە بە گەورە گرتنی ئاهەنگەکە لێی دەوەشێتەوە گوتاری بۆ حازر بکرێ. تێبینی دووەم ئەوەیە دەشێ گوتاری ئامادە نەکراو هەموو جاران نەگاتە پایەی ئەو موناسەبەی تێدا دەگوترێ، پایەی باوکیشم لای دڵدار ژووری هەموو حیسابێکەوە بوو. بەداخەوە نەمزانی ئەو گوتارەی چی لێ بەسەرهات ئەم (٤) ساڵەی بەیەکەوە خوێندنمان لە حقوق بەتێکڕایی و (٢) ساڵی بەیەکەوە ژیانمان لە ژوورێکدا بەتایبەتی، هێندەی لە ژیان و ئەدەب و شەخسیەتی دڵدار شارەزای کردووم بتوانم بە درێژی لەسەری بنووسم بەڵام لێرەدا وەرامی پرسیار لە بارەی چۆنیەتی ژیانی ئەو چەند ساڵەی دەدەمەوە نەك توێژینەوە لە باسی (دڵدار) دەکەم چی لەو ڕووپەڕانەش خرانە بەرچاوی خوێنەرەوە بایی و وەرامەکە دەکات بەڵام ماوەتەوە تێبینیەکی دوایین لە بارەی فۆرمی شەخسیەتی دڵدارەوە دەربڕین بەڵام ماوەتەوە تێ بینیەکی دوایین لە بارەی فۆرمی شەخسیەتی دڵدارەوە دەربڕم کە تەعبیر لێ دانەوەی ئاسان نییە زۆر جارانیش خۆمم بەو شیکردنەوەیەوە خەریکاندوە بۆ ئەوەی هەر نەبێ لە شێوەیەکی مەفهومدا پەڕاوێزێك بەدەوری وێنەی نەقش پەستووی تەماوی و ئامۆی شەخشیەتی دڵدار لە هەستمدا بکێشم بەڵام وەك بمەوێ جیوە بگرم، هەر جارەی ویستبێتم بەراوێزێك بە دەوری ئەو خولیایەوە بکێشم خوولیا بڵاوەی لێ کردوە.. دڵدارم بۆ دەردەست نەکراوە لەبەرچاوی زەینمدا دڵدار پەردەیەکی تەمومژی بەدەورەوە بوو نەیدەهێشت هێندەی مرۆڤی ئاسایی بۆ بینەر ئاشکراو خۆش خوێن بی، چەندێکی لەگەڵیدا ژیابێتم و تووێژم لەگەڵدا کردبێت لەیەکدی نزیك کەوتبینەوە زانیومە ئەوەی دەیبینم و دەیبستم هەموو دڵدار نییە: پشکێکی حەقیقەت دەردەکەوت کەوا هەرگیز بایی لێ شارەزا بوونی تەواوی نەدەکرد هەستم دەکرد، پشکی شرایەوەی دڵدار بە خۆی و نهێنیەکانیەوە، وەها ڕاپێچەکی قوژبنە حەشارەکانی نەفسی دڵدر دراون بوونەتە بوونەوەری سەربەخۆ کەوا ڕەنگە لە فەرمانی دڵداریش دەرچووبن. بەلای باوەڕی ئەوساو ئێستاشمەوە.

کردنەوەی دەرگا داخراوەکانی ئەو ژێر زەمینانە کاری پسپۆڕی سایکۆلۆجی بوو بەمەرجێك دڵدار خۆی یارمەتی کرانەوەیانی دابایە. هەرگیز دڵدار لە خۆوە پتر لەنیوەی حەقیقەتی خۆی دەرنەدەخست یاخود پێی دەرنەدەخسترا هەرچەندە دەیزانی، ئێمەی برادەرانی ئاگاداری ئەحواڵی هەین نەیدەگوت برسیمە، نەیدەگوت سەرمامە نەیدەگوت موفلیسم، نەیدەگوت بێ ئومێد عاشقم، نەیدەگوت فلانە ڕەفتارم لەگەڵدا مەکەن، نەیدەگوت دڵم بدەنەوە دەردی هەرە قووڵی ناو دڵی بەزماندا نەدەهات، حەزی لە شتێك کردبایە بە خامۆشی و بێ ئەوەی لە چاوان بچەقێ خشکەی بۆ دەکرد، بەڵام دەبێ بزانین کە ئەم حاڵەتەی ئامۆیی و تەماویەتی لە دڵداردا نەبو بوە نەخۆشی مەگەر نەخۆشیەکەی زمانی بدەیتەوە بەو حاڵەتە. ئینجا کە بەدواکاتەوە لە مەرگی ناکاتی ڕادەمێنم دەبینم. یا بە ڕێکەوت یا بەداخوازی بڕیاری واقیع، جوانە مەرگ بوونی دڵدار ناکامیێکی گونجاوە لەگەڵ ئامۆیی و تەمومژدا چونکە ئەوتەرزە حاڵەتە بەردەوام بوون هەڵناگرێ: نهێنی لەگەڵ تەمەنی ڕێك ناکەوێ.

دڵدار بەشە یادداشتەی وا بڵاودەکرێتەوە ئەگەر چەند پەردەیەکی ژیانیشی بە ئەکراوەیی گل دابێتەوە، هێندەی هەڵڕشتوە سایکۆزان کنەی تێدا بکات بەرەو ئەو هۆیانەی کە پەنامەکیەتی لە دڵدار کرد بەپێك هێنەرێکی شەخسیەتی وەك کە د. عەلی کەمال لە ڕێی شیعرەکانی (متنبی)یەوە بەرەو دۆزینەوەی گرێی (ئۆدیب)دا ڕۆیشت دڵداری خاوەنی (ئەی ڕەقیب)و (خەندەکەی بایی) تۆژینەوەی ئەوتۆیی لێ بەزیاد ناگیرێ.

بەغدا ١٩٨٢/١٢/٤

# دڵدار
# یونس ڕەئووف

١٩١٧-١٩٤٨م

رفیق حیلمی

دڵدار ناوی یونس ڕەئووفە، لە ٢ی شوباتی ١٩١٧ی میلادی لە کۆیە هاتوەتە دونیا، بەم حسابە بە عومر بچووکترینی هەموو ئەو شاعرانەیە کە تا ئێستە باسمان کردوون، هێشتا یەك ساڵان بووە کە باوکی هێناویەتە هەولێر، لە دوای ئەوە چووتە (رانیە)و لەوێ تا پۆلی ٢ی ئیبتدائی خوێندووە، بەینێکیش گەڕاوەتەوە کۆیەو لەوێ خوێندنی ئیبتدائی، دوای ئەوە لە هەولێرو (کەرکوك) خوێندنی متوسطەو سانەوی تەاو کردووە، حقووقی بەغدای تەواو کردووە، لاوێکی زرنگ و خوێن گەرمە، خاوەنی بیرێکی ژیرانەو پیرانەیە گیانێکی خاوێن و هەستێکی بەرزی هەیە. هەر لە منالیەوە تووشی گێرەو کێشەو تەنگووچەڵەمەی زەمانە هاتووەو ژیانێکی کەم و زۆر سەخت و تاڵ و بە ئەندێشەی ڕابواردووە، لەبەر ئەمە اشنای ساردو گەرمی دونیایەو جێگەی هیوای دوارۆژە، شاعیرێکی خواییی یە والهامی شعری لەهەوای ساز گارو لە بەرزی شاخەکانی نیشتمانەوە وەرگرتووە، بەدڵ و گیان مەفتوونی دیمەن و چاو ئەندازە شیرینە کانی وولاتی کوردستانە. هەرچەن بە هۆی منالی و خەریکبوون لە گەڵ خوێندن، زۆری شعر دانەناوەو ئیمڕۆ لە شاعیرە ناودارەکان ناژمێردرێت بەڵام بەو شیعرانەی کە هەیەو بەرچاوی ئێمە کەوتووە، وەبە نوورو گەوهەری ئەو زەکایەدا کە لەم چەن شعرەدا ئەبینرێ، جێگەی شك نیە کە دڵدار، شاعری تجدد پەروەرو ناوداری دوارۆژ ئەبێ.

لەبەر ئەوە، ویستمان کە سەرەتای ناو وشورەتی لەم (نامیلکە)یەوە دەس پێ بکا.

دڵدار، بەلای ئێمەوە شاعیرێکە زۆر باڵا، ئەگەر لە هەندێ شعریا ناپوختەیی هەبێ بەهای شاعریەتی پێ ناشکێت. منالێك کە هەموو ژیانی خۆی بە خوێندنەوە ڕابواردبێ و هێشتا لە خوێندنی پێویستی (ڕەسمی) رزگاری نەبووبێ، ناتوانێ ببێ بە شاعیرێکی (کەسبی) و بگاتە پلەی ئەوانە کە شعریان کردووە بە (سەنعەت).

لەگەڵ ئەمەیشا دڵدار، هەر لە مەکتەبی ئیبتدائی یەوە دەستی کردووە بە شعر ووتن و لەم مەیدانەدا گۆی هونەری بردۆتەوە، لەبەر ئەوە ئێمە کەمو کورتی شعرەکانی ئەومان نەگرتە بەرچاوو بڕوامان هەیە بەوە کە شاعیرێکی فطری و خودادادە، هیچ گومانی تیانیە کە هەلێکی باش و کۆلینەوەیەکی ئەدەبی وورد، دڵدار ئەگەیەنێتە ڕیزی شاعرە گەورەکانی کورد، ئەوەیش لەوێ بوەستێ کە لە لایەن بیری قووڵ و خەیاڵی ووردەوە ئێستەیش دڵدار گەلێ لە ژوور ئەو شاعیرانەوەیە کە هەندێ ووشەی ڕەق و تەعبیری ساردی وا ئەهۆننەوەو ئەیکەن بە (نەظم) کە بەدیمەن و بیستن، شیرین و ڕەنگین، بەڵام لەماناو حەقیقەت پووچ و بێ کەڵکن.

ئێمە ناتوانین لێرەدا هەندێ شعری دڵدار بنووسین کە زادەی بیرێکی زۆر قووڵ وزەکایەکی ئێجگار تیژن و بە لایشـ ئەوە ئەو شعرانە وێنەیەکی ڕوون و ڕەوانی (تەفکیری عەسری)یە، بەڵام زۆر جێگەی داخە کە پەیوەندی گرانی (تەقالید)، ئیمڕۆ، ڕێ نادا بەبڵاو کردنەوەیان؛ زۆرتریش ئەو جۆرە شیعرانەیەتی، کە دڵدارو شاعریەتی بڵندی دڵداری بە ئێمە ناسی، ئەو شیعرانەی کە لە هۆنینەوەو دروستکردنی ووشەو (تەعبیر)ی ڕەنگاوڕەنگ و رێکخستن و یەکخستنی قافیە زیاتر، کولینەوەی فەلسەفەی ژیانمان بیر ئەخاتەوەو چەشنی لێکدانەوەی ئەم شاعرەمان تێ ئەگەیەنێ‌کە بەتەمەن منال وبەمێشك گەورەو پێی گەیشتووە.

دڵدار، یەکەم جار بە (ڕانیە) لە بەرامبەر سەرچاوەی پیرۆزە ڕەنگی ئاوی (قوولە)، رۆحی شاعریەتی بزوتوەو هەر لەو ڕۆژانەدا کە لە فریوی زەهراوی شارستانیەتی دووربووەو چاوی ئازادی بێ پەردەی بە چاوئەندازەکانی شیرین ورەنگینی نیشتمانا گێڕاوە، لە کانگای دڵیا مەغزی ئەم شعرانەی کۆ بوەتەوەو تۆمارێکی نهانی دروست کردووە. لە دوای بەینێك کەلەو چاوئەندازانە دوور ئەکەوێتەوە کارەساتی زەمانەو گێژەڵووکەی بێ ئامانی ژیان گێژی ئەدا ئەو تۆمارە شارراوەیە ئەکرێتەوە ئەویش بێ ئەوەی ڕەنجێکی لەگەڵ بدا شعرەکان دووبارە ئەکاتەوە ویا بە نووکی قەڵەمەکەیا ئەڕژێتە خوارەوە.

کوردستانی خۆش نیشتمانی جوان
تۆ قیبلە گاهی منی بێ گومان!
چاوم پشکووتوی شاخەکانتە،
فێری ژیانی باخەکانتە
دەنگی شمشاڵی شوانە کانت
زریق و باقی جوانە کانت
قاسپەی (کەو)انی قەد کێوەکانت
خوڕڕەی ئاوەکەی نشێوە کانت
ئەمانە هەمووی گوێیان کردمەوە
هەوێنی شیعری دڵیان گرتمەوە

***

ئەونەمامێ بووم لەم خاکە ڕووام
بەخۆشەویستی وولات ئاودرام
بەڵێ کوردستان تۆ منت خوڵقان
تۆ منت خوڵقان پێت بەخشیم ژیان!
خۆشی ژیانم خۆشی ژینتە.
ئیشی ژینی من ڕۆژی شینتە!
چونکە کوردستان، نیشتمانی جوان!
توقیبلەگاهی دڵی بی گومان.

***

دڵداری هاونیشتمانی حاجی قادری کۆیی کە یەکێ بوولە شاعرە ناودارەکانی کورد، لە شیعر (وتن)یشا پەیڕەوی ئەم هاونیشتمانەی خۆی کردووەو لەسەر شوێنی ئەوڕۆیشتووە. لە خوارەوە وێنەیەکی تریش لە شیعری دڵدار ئەخەینە بەرچاوتان:

دڵ بە دووی ئەفسانە کەتوو وای ئەزانی وا ئەبێ
ئیشی دونیا ڕەنجی پێ ناوێ بە خۆی کۆتا ئەبێ
ئەی ئەزانی ئەوبە عارەق داری هیوا ئاو ئەدا
گەر بەخوێن پەینی بدا ئەوجا ثەمەر پەیدا ئەبێ
لەفزی نابێ، نابی بیزانی کە لاوی کوردی تۆ
هەر بەکۆشش دێتەبەر، باغی ئەمەل إحیائەبێ
تالعو اقباله وەهمی پای بەندی بێ هونەر
کاری چاکی ڕێ بخەی، عەزمت هەبێ خۆی چائەبێ
ئەی برا! لادە لە فیکری کۆن و زووسا ڕاپەڕە
عەزمی مەردانت ببێ هەرچیت نیازبێ وائەبێ
مردنە ژینت بەبێ کاری، لەستی لا بدە!
هەر بەڕەنجی لاوی وەك تۆ نیشتمان ئاوائەبێ.

ئەم شیعرانە کە باسی هەندێ دەردی کۆمەلایەتی و نیشتمانیمان ئەکات و چارەسازی ئەمانەمان پیشان ئەدا، هەروەکو لەلایەن بیرەوە پوختەو بەکەڵکە لە نیگای ئەدەبیشەوە پەسەندو بەهادار و لە سەنعەتی شعر کەموزۆر بەشدارە، لە لایەن وەزن و قافیەشەوە کەموو کورتی نیەو بەڵکوو ئەتوانم بڵێم کە قافیەکانی زۆر جوان و شاعیرانەیە.

ئەوەندە هەیە قافیەی (وانەبێ) لە سەدری(١) بەیتی یەکەما هاتووە لە عەجزی بەیتی پێنجەما دووبارە بۆتەوە.

لە دوونیوە شعرەکانی:

لەفزی نابێ، نابی بیزانێ کە لاوی کوردی تۆ

کاری چاکی ڕی بخەی، عەزمت هەبێ خۆی چا ئەبێ

دا/ (جناسیکی تام)ی زۆر جوان و لە بەیتی دووەمی دوای مەتلەعە کەیشا (تەشبیەو ئیستعارە)ییکی شاعرانە هەیەو بە کورتی شعرەکان هەموی بەهێز (مەتین) ئاهەنگدارە.

دڵدار لە ڕێگەی (شیعری چیرۆکی) شەوە خزمەتی کۆمەڵایەتی و کردوە شعرەکانی (قەل و ڕێوی) یەکێکە لە وانە:

ڕۆژێ لە ڕۆژان قەلێ

**وەستا لەسەر کۆلکە چلێ**
**سەلکێ پەنیری لە دەنووک**
**ویستی کە بیخوا لە هەلێ**
**ڕێوی بەلایا تێپەڕی**
**چاوی بەقەل کەوتوو مەلێ**
**ویستی بە فێلێ لێی سەنێ**
**دەسی پی کرد پیاهەڵ بلێ**
**وتی ئەی بولبولی زەمان**
**ئەی نەغمەخوانی سەر تەلێ**
**بیستومە من ناوبانگی تۆ!**
**توو خوا گۆرانیم بۆ بلێ**
**قەل وەختێ زاری داپچڕان**
**پەنیری کەوتە بن تەلێ**
**ڕێوی پەنیری قۆستەوە**
**بەڵام لە پێش ئەوەی هەلێ**
**وتی : ئەوجا بەسە نەفام**
**گوێت لێ بێ ڕێوی بۆت بلێ**
**وەختێ شتێکت گرتە دەم**
**کەرمەبە گۆرانی مەلێ**
**ئەمەیش کەرانەبێ کەوا**
**تەفرە دراوی توچەلی**

مەوزووعی ئەم فیکرە لە زمانی بێگانەوە وەرگیراوەو (بی کەس)ی شاعری ناوداری (سلێمانی)ش بە وێنەیەکی شیرین خستۆیەتە سەر زمانی کوردی، وەرگێڕانەکەی دڵدار لە جوانیا لە هینەکەی بێ کەس کەمترنیە. دەستکاریەکی کەم کەتیانەبینرێ حووسنێکی تری داوە بە فکرەکە. واتەهەر وەکوو کچێکی دڵبەری بێگانە، بەرگێکی نایابی کوردی لەبەر کرابێ شیرینیەکەی فریوێکی زیاتر پەیانەکا وزوتر ئەچێتە دێ لاوێکی کوردەوە! ئەم فکرەیش- بەلای منەوە- دوای ئەوە کەوەر گێر ڕاوەتەسەر زمانی کوردی جوانترو شیرینتر بووە.

دڵدار، شعری غەرامیشی وتوە. ئەمە یەکێکە لەو شعرانەی:



**ئەی بای شەماڵ!**
**ئەی بای شەماڵ! ئەی بای شەماڵ**
**ئارامی گیان و دڵەی وەك زوخاڵ**
**پۆستەی هەوایی! پەیکی موژدە بەر!**
**ئەگەر هاتوو ڕێت کەوتە کوی دولبەر**
**وەك عارەب دەخیل! کە چویتە ئەولا**
**مەوێستە تاکوو خێوەتی لەیلا!**
**مەوێستە تاکوو لای شۆخی کەوا**
**تیری نیم نیگای لە دڵما ڕووا**
**پێی بڵێ گیانە لەم ڕێگەو بانە**
**لەم چەمو بێشەو هەردەو کێوانە**

(شێت) ێکی شەیدا ڕووتو قووتم دی
فرمێسکی ئاڵی وەك یاقووتم دی
ڕووی لە خوێن خاڵی وەك زەعفەرانە
چاوەکانی لێیل پڕ لە گریانە
بڵی هەیکەلی وەك ئێسقانم دی
قەدی چەماوەی وەك کەوانم دی
بڵێ خەیاڵی بەژنو بالاکەت
تیشکی ڕووناکی شەوقی لالا کەت
ئەرگسی شەهلای چاوی بەخومارت
خەرمانەی زوڵفی لەسەر ڕوخسارت
فرشتە ئاسا ساتی هەزار جار
خۆی نیشان ئەدا خۆی ئەدا حەشار
بڵی ئێستاکەش ئەوماڵ وێرانە
ئەو کەژ مەسکەنەی وێڵی شارانە
هەر بە ئومێدی جەژنی وصاڵە
بژی پێت دەگا هەروای خەیاڵە
جار جاریش لەدوای ناڵەی دڵی زار
فرمێسك ئەڕژێنێ وەك هەوری بەهار
***

پۆستەی هەوایی پەیکی موژدەبەر
هاتوو ئەگەر ڕێت کەوتە کۆی دڵبەر

چەن شاعیرانەیە ؟ وچەند وەصفێکی شیرینە بوبای شەماڵ! ئەم بەیتەیش کە ئەڵێ:

مەوێستە تاکوو لای شۆخی کەوا
تیری نیم نیگای لەدڵما ڕووا

هەر بەشاعیرێکی سەنعەتکارو شارە زای ئەدەب بەهای بۆ دائەنرێ.
لە (بەیت)ی:

جار جاریش لەدوای ناڵەی دڵی زار
فرمێسك ئەڕژێنێ وەك هەوری بەهار

دا (سەنعەتێکی مەقصود) هەیە واتە بە تایبەتی (ڕژاندنی فرمێسك) ی دوای (ناڵەی دڵی زار) خستوە تاوەکوو دەسەڵاتی شاعر بەسەر مەغزای شیعرەکەیا وەکوو (حوکمی تەبیعەت) بەسەر هەوری بەهارا (جاری) بی.

دڵدار بە تایبەتی لە پەندو مەوعزەی میللیدا دەستێکی درێژی هەیەو بە گەڵێ وتاری بەهادارو شعری جوان ڕێگەی ژیانو سەرکەوتنی پیشانی لاوانی دوا ڕۆژ داوە.

بە ڕاستی پەندنامەیەکی بەرزو بەنرخە. شعرەکانیشی هەر چەن سادەیە بەڵام زادەی تەبیعەتێکی ئازادو ڕەوانەوە ئەشی کە بە (سەهلی مومتەنع)ی دابنێین. خۆزگە کە هەموو لادێکی کورد لەسەر ئەم پێو شوێنە ئەڕۆیشت ئەوسا کە دەرئەکەوت کە ئەم قەومە چۆن دەس لە مل و هیوا ئەکاو ئەگا بە ئامانجی پیرۆزی!

باسی دڵدار لە هەنگامی ژیانی خۆیا کە هێشتا قوتابی (کلیەی حقوق) بوو نوسرابودوە بەڵام لە چاپدانی ئەم ئامیلکەیە- داخی گرانم- کەوتە دوای مردنی.
*بەرگی دووەمی (شعرو ئەدبیاتی کورد) مامۆستا رفیق حیلمی

# دڵدارو بەهرەی تازە کردنەوەو پێشکەوتن

عبدالرزاق بیمار

بەڕاستی لەبەرامبەر ئەم کەسێتی یە مەزنەدا پیاو سەرسام دەبێت. نازانێ لەکام بابەت لەبابەتەکانی ژیانو ئەدەبیاتو خەباتی یەوە دەست پێ بکات دڵداری بەهرەدار دڵداری ڕۆشنبیر؟ دڵداری خەباتکەری شۆڕشگێڕ؟ دڵداری شاعیر؟ دڵداری تازە کەرەوە؟ ئەنجا دڵداری جوانەمەرگ؟

کە هەربابەتێك لەم بابەتانە شایانی لێدوانو لێکوڵینەوەیە ئەمانە گشتی کەلەگەڵ تەمەنی تەرچکی سپی بەهاری‌دا بەراورد بکرێتو لەگەڵ بارو دۆخی سیاسی و ڕۆشنبیریی کورد لە سالانی سی و چلەکاندا لێك بدرێتەوە، سەرسامی زیاتر پەرە دەستێنێت. باسکردنی ئەمەش بە چەند وتەیەکی سەر پێیی تەواو نابێتو پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەل هەیە. لە بواری دڵدار ناسیش دا مامۆستایان: ڕەفیق حیلمی، کاکەی فەلاح، د. مارف خەزنەدار، دلزار، کەریم شارەزا، عبدالخاق علاءالدین، کەمال غەمبار، د.مکرم تاڵەبانی و شێرزاد عبدالرحمنو چەند مامۆستایەکی دی شوێنەواریان دیارە.

## دڵداری خۆناس

کە سەیری ژیننامەی دڵدار بکەیت، هەر لە منداڵی یەوە تاکۆچی دوایی بۆت دەردەکەوێت کە دڵدار خاوەن کەسێتی خۆی بووە، خاوەن ڕاو هەڵوێست بووە. بە خۆیا ڕاپەڕمووە کە پێش بکەوێو ئەوەی نیازیەتی بەدی بهێنێ دوای ئەوەی کە تواناو زیرەکی ئامادەیی پێشکەوتنی لە خۆیا دیوە. ئیتر لەناو خێزانو بنەماڵەدا بەرچاوو ڕێزلێ گیراو بووە بەڵکو حیسابێکی تایبەتیشی بۆ کراوە.

لەناو ڕیزی قوتابخانەدا پێشکەوتوو پلە یەکەم، لەناو منداڵاندا هەڵکەوتوو، مووزەردی سپی چاوشینی ڕێکوپێكو پاکو خاوێن. باوکی مەئموری میریو مەلایەکی شارەزاو ئەدەب دۆستو زمان تیژو قسە ڕەوا. براکانی خوێندەوارو مەئمورو ماڵەکەیان خاوەن کتێبخانەو دیوەخانەو کۆڕی باسو ڕووداوی سیاسەت چاوکراوەو شاران دیتوو. لە کۆیە، ڕانیە، مەخمور، هەولێرو کەرکوك ژیاو ئاگاداری گۆڤارو کتێبی میسرو لوبنانو شارەزای گەشتی ئوتومبیلو کارەباو سینەماو چاپە کە ئەوسا تا دڵدار لە ژیاندا بوو (کۆیە) کارەبای بۆ نەهاتبوو.

دڵدار بەخۆیەوە خەریك بوو. هەوڵی دەدا شت بزانێو شت فێرببێ. لە تەمەنی دە دوانزە ساڵی‌دا وەکو خۆی دەڵێ: ((هەر نووسراوم بدیبایە ئەمخوێندەوەو ئەمتوانی کە بە کوردی زۆر چاك بنووسم)). هەر لە قۆناغی خوێندنی ناوەندی‌دا تورکی کۆنو نوێ بە باشی فێر بوو، دوای ئەمەش فارسیو لە خوێندنی ئامادەییدا بە عەرەبی وتاری دەنووسی. لە تەمەنی لاوی‌دا جگە لە کتێبەکانی یاسای پەیوەندیدار بە خوێندنی لە کۆلیجی

(حقوق) جۆرەها کتێبی لە فەلسەفەو ئاینو مێژوو (بەتایبەتی مێژووی کورد)و ئەدەبو سیاسەتو ڕۆشنبیری گشتی دەخوێندەوە.

هەر کەسێ ئەو چەند لاپەڕە کەمەی یادداشتی ژیانی دڵدار بخوێنێتەوە دەگاتە ئەو ئەنجامە کە ئەو منداڵە، پاشان ئەو مێرد منداڵە لاوە یەکێکی بەهرەدارو هەڵکەوتوو بووە. نەك بۆ لاف بەڵکو بە دڵنیایییەوە ئەویش خۆی بەم جۆرە ناسیوە بۆیە باسکی لێ هەڵماڵیوە بە جەرگانە لە جەنگی ژیاندا پێی خۆی چەقاندووەو ئامادەی دەرکردنی گۆی هونەرمەندیو کارامەیی بووە. هەرکەسێ لەسەر دڵداری نووسیوە شاگەشکەی زیرەکیو بلیمەتی بووە. مامۆستا ڕەفیق حیلمی نووسیویەتی: ((بڕوامان بەوە هەیە کە شاعیرێکی فیطری خوادادە. وەبە نوورو گەوهەری ئەو ژەکایەدا کە لەم چەند شیعرەدا ئەبینرێ))(١-ل٩،١٠) کاکەی فەلاح دەڵێ: ((خۆ خەریك کردن بە کاروباری بەرهەم دانان. بەکوردیو بەعەرەبی لەو تەمەنە کەمەداو بەو لاوێتییەو بەدەم ئەو هەموو ناتەواویی ژیانو نەخۆشیانەوە نیشانەی بەخۆدا ڕاپەڕموونو تواناو زیرەکیو هەستێکی دڵسۆزانەی قووڵو دیارە.)) (٢-ل١٠٢).

## دڵدارو شیعر

سەرەتا دڵدار گوێی لە شیعری کۆن گرت، شیعری فارسیو تورکیو کوردی چ لە دیوەخانەکەی باوکیو چ لە مزگەوتی (خادم السجادە)ی بەرامبەرماڵیان شیعری کوردییش ئەو شیعرانەی کە سەر بە قوتابخانەی تەقلیدین. بە ناوبانگترین شاعیرانی کۆیەی ئەو دەمەش:

عەونی، عاصی، حسینی، صافی، دلاوەر و راجی بوون. ئەو لەگەڵ دڵزارو وردیو سەید ئەنوەرو روستەم نەوەی دوای ئەوان پێك دەهێنن.

لەناو ئەمانەدا (عەونی) تا ساڵانی پەنجاش هەر لە شیعر بەرهەم هێناندا بە زۆری بەردەوام بوو. ناوو شۆرەتی جگە لە غەزەل لە شیعری سیاسیش دا زۆر وبڵاو وشاعیرێکی دیارو خاوەن جەماوەر بوو ئەگەرچی لە ناوەڕۆکدا چوارچێوەی شیعرەکانی فراوان کردو گەلێ بابەتی کۆمەڵایەتیو سیاسی گرتە خۆی بەڵام لە ڕووی ڕوخسارو پەیکەری شیعرەوە پێشکەوتنێکی سەرنج ڕاکێشی پیشان نەدا. دوای ئەو (دڵزار) دێ کە بەهێزی شاعیرییەت خۆی لە ریزی پێشەوە چەسپاند، لە بواری شیعری سیاسیی شۆڕشگێڕیدا گەلێ نموونەی گەشو ئاسراوی بەرهەم هێنا هەرچی دڵدارە، لە خۆڕاو بەڕێکەوت نەهاتە ناو مەیدانی شیعر دانانەوە. بەڵکو بە ویستو خواستی خۆی! بەڵێ شیعری نالیو کوردیو مەتفیو حاجی قادرو ڕەفاییو صافیو شیعری شاعیرانی هاوچەرخی خۆشی دەخوێندەوە. سەرەڕای شیعری عەرەبیو تورکیو فارسی. بەڵام بەچاولێکەریی ئەوانو لەژێر کاریگەری ئەوان‌دا زمانی بۆ شیعر نەبڕا. بەڵکو بە بڕیاردانو بەپێ لێداگرتنەوە دەستی دا قەڵەمو بابەتێکی تازەی هەڵبژاردو شەوێك بۆی دانیشت تا شیعرێك دابنێ. ئەوەتا لە یاداشتەکەیدا- کە ئەوسا لە قۆناغی خوێندنی ناوەندی هەولێر بووە- دەڵێ: ((خۆم ئیمتیحان کرد کە ئایا ئەتوانم شیعر دابنێم؟ شەوێکیان تا درەنگ نەنوستم. قەسیدەیەکی پانزە بەیتیم دانا کە تەصەوری دایکێکم تێدا کردبوو بۆ ڕۆڵە لەسەورە کوژراوەکەی چۆن ئەگریا. ئەمە یەکەم شیعر بوو کە دامناوە( (٣-ل٥٠).

جا ئەمە کە یەکەم شیعری دڵدار بوو، سەیری کرد لە تاقیکردنەوەدا دەرچوو، ئیتر دەستیدا قەڵەمو هەمە جۆرە شیعری نووسی: غەزەل، شیعری ناو مەجلیسان، بەشێوەی کۆنو بەکەرەستەی کۆنو بەکەرەستەی هونەری قوتابخانەی تەقلیدی. جا پێی خۆش بوو لەگەڵ (عەونی) پێکەوە غەزەلێك دابنێ ولەگەڵ (جاهد)ی هەولێریش شیعرێکی نێو مەجلیسان بڵێو بۆ ئاوازی گۆرانییەکی عەرەبی (زولفو ئەگریجەی یار)) بنووسێتو لەسەر کێشی

عەروون، لەسەر یەك دەنگی پاشبەند تاك تاك هەڵبەستی دڵداریی شێوەی جاران بهۆنێتەوە. بەڵام ئەمانە هەر بۆ لاف یان بڵێین بۆپێ چەقاندن، دەنا شالاوی ڕۆشنبیری تازەی شاعیرو لافاوی ئاواتو بیروڕای سیاسیو لە پێناوی کوردایەتی بەندو بەستی کۆنیان شکاندو بەرهەمی تازەیان لە شیعر پێ هێنایە بەرهەم.

نموونەی شیعری هاندانو بزواندنی گەلو گوڕپێدانی خەبات بۆ وەدەست هێنانی مافەکانی کوردەواری. وەکو ئەوە کە ڕوودەکاتە لاوان:

**ئەرێ ئەی لاو، لە هیچ وەختێ نەکەی مەئیوسی ژینت بیت**
**دەبێ هەردەم عەزمدارو دەوای دەردی برینت بیت**

هەروەها لە شیعرێکی تردا کە ساڵی ١٩٣٦ لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا دەڵێ:

**ئەرێ ئەی کورد لەنێو گەلدا هەتا کەی ماتو داماوی؟**
**کە عالەم سەربەخۆن گشتی ئەتۆش پەیوەندی ناو داوی؟**

لە شیعرێکی تردا کە لە ١٩٣٨دا دایناوە وەکو پرۆگرامێك ڕێگەکانی خەباتی شۆڕشگێڕانەو دەوری گرنگی لاوان لە ڕاپەڕاندنی میللەتدا دیاری دەکات:

**ئەسلەحەی هەر میللەتێ سا دەستو بازووی گەنجیەتی**
**ڕۆژی شوعلە بەخشی ئومێد فیکرو کاری گەنجیەتی**
**مەرهەمی زامو برینی کردەوەو هەم ڕەنجیەتی**

***

**میللەتێ گەر خوێنی ئەڕژێ دەستوپێی ناکرێتەوە**
**بێ کیفاح گوفتار وەسیقەی ژینی پێ نادرێتەوە.**

لەم جۆرە شیعرانەی کە بە شیعری سیاسی ناوی دەبەن ڕێچکەی شۆڕشگێڕی هەڵبژارد، کە ڕەنگدانەوەی دڵگەرمیو هەستی نەتەوەیی خۆیو خەباتو کردەوەی چالاکی حیزبایەتی بێت.

هەست کردنی بە مەحروومی نەتەوەکەی هاندانی نووسینی شیعری گەرمی سیاسی بوو سەرەڕای ئەمەش لەو دەوروبەرەی تێیدا ژیا شیعری شۆڕشگێڕی بەجۆرێك بوو کە لە دەمارگیری نەتەوەیی نزیك بوو. بەتایبەتی پاش سەرکوت کردنەوەی شۆڕشەکانی کورد لە تورکیا بەو پەڕی دڕندایەتی. وە هەوڵی ئەم لاو ئەولای سڕینەوەی کەسێتی کوردو بیرکردنی زمانو ڕەسەنایەتی.

لەو شیعرانەی کە لەبیرم ماون ئەم تاکە توندو تیژو تووڕەیە کە وەکو بەڵگەنامەیەکی مێژووی ئەدەبیات لێرەدا تۆماری دەکەم:

**ئەسڵەحەی جەنگی دەبەستم پاسی کوردستان دەکەم**
**قەتلو عامی تورکەکانو غارەتی ئێران دەکەم**

لەگەڵ ئەوەشدا دڵدار تووشی دەمارگیری نەتەوەیی نەبوو. چ لە سەرەتاو چ لە دوادوای ژیانیدا. تەنیا وەکو بەرگرییەکی ڕەوا لە بوونو مافی نەتەوەکەی دەنگی دلێری لێ هەڵدەبڕێ:

**کەس نەڵێ کورد مردووە، کورد زیندووە**
**زیندووە قەت نانەوێ ئاڵاکەمان.**



## دڵدارو تازەکردنەوە

ئەوانەی لە باسی تازە کردنەوە دواون، ڕاستی‌یەکی تەواو ڕاستیان بەرچاو نەگرتووە، ئەویش ئەوەیە دڵدار لە دەرەوەی کەرانەی ئەو هاوکێشەی تازەکردنەوەدایە کە لە سلێمانی سەری هەڵدا. لەبەر چەند هۆیەك.

یەکەم: هاوتەمەنی بزوتنەوەکە نەبوو کە لە ساڵی ١٩٢٠ تا ساڵی ١٩٣٠ی خایاندو ئەدەبی تورکی کاری تێ نەکردبوو.

دووەم: شاعیرانی دەوروپشت و مەڵبەندی کۆیەو هەولێر کەلەمەوپێش ناومان بردن لەسەر ڕێبازی قوتابخانەی تەقلیدی دەڕۆیشتن. ڕاپەڕینەکەی پیرەمێردی شاعیرو ڕۆژنامەی ژین و نوێ کردنەوەی لە مەودوای گۆرانی هونەرمەند بەوتین و تەوژمە نەبوو کە لایەنگران و پەیڕەوکەران بۆ خۆیان پەیدا بکەن ڕۆژنامەی (زاری کرمانج)ی ڕەواندزو گۆڤاری (ڕوناکی)ی هەولێر لە پرۆسیسی تازەکردنەوەی شیعردا دەورێکی ئەوتۆیان نەبوو ئەم حاڵە مایەوە هەتا گۆڤاری (گەلاوێژ) بوو بە چاپەمەنییەکی گشت لایی و خەڵکی لایەکانی کوردستانی لەخۆی کۆکردەوە، تەنانەت کەسێ لەو شاعیرانەی کۆیە کێشی خۆماڵی لە لایەنی سیاسیشەوە ئەو شیعرەی لەناو کۆڕو کۆمەڵانی کوردستاندا بڵاو بوون شیعری کوردایەتیی زێوەرو ئەثیری و بێکەس و ئەحمەد موختار بوو شیعرە سیاسییەکانیش با لە ناوەڕۆکدا پەلیان بۆ بابەتی تازە درێژکردبێ بەڵام هەر لەسەر شێوەی پێشوو دەنووسران.

سێیەم: دڵدار بەپێی ڕەوتی پێگەیشتن و زیرەکی و لێهاتوویی خۆی خاوەن بڕیاری خۆی بوو، بەخۆ ڕاپەڕموو بوو هەروەکو لە لە مەیدانی خوێندن و ڕۆشنبیری و سیاسەت و کۆمەڵایەتی‌دا بەهیمەت و خاوەن کەسێتی خۆی و سەرکەوتوو وپێشکەوتووبو. هەروەها ئامادەش بوو سەربەخۆ لە مەیدانی شیعریش دا هەر بەرەو پێش بچێت. لاسایی نەکاتەوە. تازەکردنەوەی ئەو ڕێچکەیەکی نوێ و تاموبۆیەکی خۆکردی هەبێت.

ئەوەبوو کە لە خەباتی سیاسی‌دا تێ هەڵچوو و حیزبێکی پێکەوە ناو بوو بە سکرتێری حیزبەکەی (هیوا)ی کورد. بەسۆزو دڵێکی پڕ لە کەف و کوڵ و بە هەستێکی ڕاستگۆیانەو لەسەر بنەڕەتی مەنتیقی و ژیری‌یەوە بە ئاوازێکی نوێ و بە وشەو دارشتنێکی تازە ڕوودەکاتە کوردستان کە هیچ زۆردانەدەم و زیادەڕۆیی تێدا نی‌یە ئەگەر بڵێم لە گشت ئەو سروودانەی زێوەرو بێ کەس و گۆران بەرزترە کە ڕوویان پێ کردوەتە کوردستان و بە ئاشکرا دیارە کە تەکانێکی تازەکردنەوە بوو لەو بوارەدا. سەیرکە چەند ڕوون و ڕەوان و بە زار زمانێکی شیرین هەروەکو بەرامبەر بەیارو دڵبەر یان دایکی بوەستێ ساڵی ١٩٤٠ وەها دەڵێ:

کوردستانی جوان
تۆ قیبلە گاهی منی بێ گومان
چاوم پشکوتوی شاخەکانتە
فێری سەیرانی باخەکانتە
دەنگی‌شمشاڵی شوانەکانت
زریق و باقی جووانەکانت
قاسپەی کەوانی قەد کێوەکانت
خوڕەی ئاوەکەی نشێوەکانت
ئەمانە هەموو گوێ یان کردمەوە
هەوێنی شیعری دڵیان گرتمەوە
ئەو ئەمامێك بووم لەو خاکە ڕوام
بە خۆشەویستی تۆوە ئاودرام.
تا د .

دڵدار هەڕەمەیی لەو مەیدانەدا هەڵناکشێ چونکە بەلای ئەوەوە ژیان تێکۆشان و زانایی و خۆ ئامادەکردنە هەر زوو ئامۆژگاری (جاهد)ی شاعیری هەولێری دەکرد، پێی دەگوت: (ئەدەب بەبێ ثەقافەت چ قیمەتی نی‌یە) واتە هەر پشت بەستن بە بەهرەی خۆیی و پەیڕەو کردنی ڕێگاو شێوازە ئامادەکراوەکان شیعر بەرهەم نایە. بەڵکو پێویستی بەڕەنج و تاقیکردنەوەو خۆ ڕۆشنبیرکردن هەیە. بۆیە کەوتە خوێندنەوەی ئەدەبی تازەی عەرەبی. لەم ئەدەبەشدا شەپۆلی تازە کردنەوە لەسەر دەستی ئەدیبە لوبنانی‌یە ڕۆژاوانشینەکان وەکو جوبران و ئیلیا ئەبو ماضی میخائیل ئەعیمەو ئەدیبە میسری‌یەکانی وەکو خەلیل مەتران و علی محمود طه و نووسەرو شاعیرانی گۆڤاری (الهلال) و (الرسالة) سەرنجیان ڕاکێشا بەڵام سەرنج ڕاکێشانەکەش نەگەیشتە ڕادەی لاسایی کردنەوەو دووکەوتن. شاعیرێکی وەکو جاهد نەیتوانی تەنانەت لە کەمو کووڕیی زارزمانی ناوچەیی شاری هەولێر ڕزگار بێت و زمانەکەی خۆی دەوڵەمەند بکات و ئاسۆی بیرو تێڕوانینی خۆی فراوانترو ڕەنگاو ڕەنگ بکات.

لەم ئەدەبە نوێ‌یەدا ڕێبازی ڕومانسی هاتە ناوەوە، کە وای لێ هات واتا نوێخوازی هامبەر و هاوتای واتای ڕۆمانسی بێت، دڵداریش کە لە کاروانی شیعر داناندا بەرەو پێش چوو چار نەبوو خەڵك بە ڕۆمانسییان دانا. بەڵام دڵدار لەم ڕێبازەدا نقوم نەبوو ئەم لایەنەی کە بریتی‌یە لە زیادەڕۆیی و دەربڕینی سۆزو عاتیفەی دڵشکاوی و خەمۆکی و ڕەشبینی و خۆنقوم کردن لە خەون و خەیاڵ و سروشت پەرستی و شەیدای شەوو لە کۆمەڵ دوور کەوتنەوەو خۆ خەریك کردن بە بابەتی مردن و مەرگەسات و دیمەنی پڕ لە کارەساتی ژیان.

دڵدار ئەم لایەنەی نەگرت. نموونەکانی (خەندەکەی بایی) و (گوڵی سوور) دوو نموونەی بەرزی تازە کردنەوەی نموونەی هەنگاوی گورج و بەگوڕی دوا ڕۆژی شاعیرن. بەڵام تازە کردنەوەکەی دڵدار هەر بە بڕیار بووە، دیارە دوای بەراوردو لێ ورد بونەوەو بیرکردنەوە بووە. چاکترین بەڵگە بۆ ئەمەش دەست نیشانی هەڵوێستێکی هاوچەشنی دەکەین: ئەوەبوو کاتێك کە هەڵمەتی نووسینی کوردی پەتی لە ساڵانی چلەکاندا پەرەی سەند گۆڤاری گەلاوێژ دەورێکی باشی لەم هەڵمەتەدا هەبوو دڵدار بەهێمنی و بە پشوویەکی قووڵ لەم هەڵوەستەدا دەڵێ:

((من بەش بەحاڵی خۆم کە خوێندەوارێکی ئەم گۆڤارەم حەدی ئاوەنجی بەسەر پێ لێ هەڵبڕیندا دەبژێرم کە نابێ ئێمە زۆر زۆر بە کوردی‌یەکی پەتی بنووسن چونکە بۆ ئەم (ئینقلابە) گەورەیە ئامادە نەبووین هێشتا هەرچی‌یەکی کە پێویستی ئەم کارە بێ ئەمان کردووە، کە ئەویش فەرهەنگێکی کوردی دانان و ئەم فەرهەنگە پەرە پێ سەندن ئنجا کوردی پەتی نووسینەوە.) (٣-ل١١٣)

هەر بەم جۆرەش تازەکردنەوەکەی شیعریشی پێ بەپێ هەنگاو بەهەنگاو بوو هەر لە سەر کێشی عەرووز لە بەحری (هەزەج) بە پاشبەند (قافیە)ی جۆراو جۆری ئەورووپاییانە دوای چوارینێك کە هەر دێڕەی چوار تەفعیلەی تێدا دوو دێڕی دوو تەفعیلەیی دێن، پاشان دێڕێکی چوار تەفعیلەیی تر، لە پاشبەندا لەگەڵ پاشبەندی دێڕی یەکەم دا جووت دەبێتەوەو وەکو مەقام و بەستەو گرێدانەوەی بە مەقامەکە.

ئەم جۆرە کێشە زۆری پێ نەچوو بووە سەرمەشقی شاعیرانی بەناوبانگ وە گەڵێ نموونەی لەسەر داناو هونەری پێشینەییش بۆ دڵدار دەگەڕێتەوە. لە کێشی خۆماڵیش دا کێشی ئازادی هەر بەکارهێنانی دێڕی هەشت بڕگەیی و چوار بڕگەیی‌تێکەڵ کردووە:

نیشانەی چاکەو بێ بەریم
دەربەدەریم
ئەی نازەنین
ڕەوانی ئەم نازە تازەنین
خۆ تازە نین

تەنانەت لەسەر کێشی هەڵبەستێکی ئینگلیزی گۆرانی‌یەکی ڕۆژاوایی بەم جۆرە نووسیوە: (٤):

لە بن سایەی چەمە نزاری بەهاری
با پێکەوە بین، یەك دڵ و ڕووخۆش
دڵ ڕوون و خرۆش
با ڕاوێ بکەین سا
هەڵبستە من و تۆ دڵی پڕ جۆش

## خەندەکەی بایی

هەڵبەستی (خەندەکەی بایی) هەڵبەستێکی داڕشتن پتەوو خەیاڵ فراوان و زادەی هەستێکی بەکوڵ و دڵێکی بەسۆزو فیکرێکی گەشاوەو وردبینە، پڕە لە وێنەو دەربڕینی قوڵ و ڕستەی چڕ، پڕە لەوشەی ئیجادەرو کرژو هەست بزوێن و بیر ڕاکێش. تاقیکردنەوەیەکی تازەیە لە ئەدەبیاتی کوردی لە دروستکردنی پەیکەری هەڵبەست و چ لە جۆری دەربڕین و نەخشە کێشان کە یەك تەونی سفتی ڕازاوەو یەك بابەتی ڕێکوپێکە کە بۆ یەکەم جار لە دەفتەری شیعری دڵداریدا تومارکرا. بۆ یەکەم جار وشەی (بایی) هێنا ناو شیعرەوە لەگەڵ چەند دەبڕین و ڕستەی تازەی وەکو: (خەندەکەی بایی، پڕیشکی تیشك، دڵی پڕ خوێن و پەنجەی ڕاز، خەندەی نەرم، هەموو شت چەپڵەی گوشادی لێ دەدەن، چەژەی تاڵاو، ئەمرینی (ئەمری)، پەلکی ئەژاکاو، دامەن شۆڕ، ئابیدە، خودای شیعر، بڵێسەی هەست، هاوڕەگ و خوێن)

ئەمەو لەهەمان کاتدا کە هەندێ وشەی عەرەبی پێویستی بەکار هێناوەو سوودی لە هێزی گەیاندن و دەنگو ئاوازیان وەرگرتووە وەکو: (ئافاق، مەصدەر، وەصل، مەسروور، فەیض نوور، قودرەت، تەبجیل، ئیکلیل.)

هەڵبەستەکە هەر خەیاڵێکی ڕۆمانسیانە نی‌یە، بەڵکو ڕەمزێکی ڕووناکی پێ‌یە. پوختەکەی ئەوەیە کە:

لە ئاسۆی ژیانی خەم و ئانومێدی دا شەوێك فرشتەی هیوای بەدی کرد، وەکو تیشکی ئەستێرە کونجی دڵی تاریکی پڕ خوێنی ڕووناك کردەوە. بەڵام فرشتەکەش هەرچەندە جوانەو دڵارامە، خونچە بە لانەی ناو زوڵفی خاوی شا گەشکە دەبێ هێشتا خەمبارە، شاعیر داوای لێ دەکا شادبێت. مادام دنیا

شادەو پێی دەڵێ: ئێمە لەسەر ئەم خاکە گەردێکین دەبا ئێمەش شادبین.. دەی بابچینە ناو پەرستگای دڵدارییەوە، ئەو پەرستگایەی لە تیشکی هەتاوو لە تریفەی مانگ‌و لە ڕەنگی پەلکە ڕەنگینە دروستی دەکەین، لە شوێن ئەو باغەی کە پار هاوین تۆم لەوێ دیت.. ئەودەمە تیپ تیپ پەری چەپکە بنەوشەی پێشکەش دەکەن، تۆش لە کراسی پەلکی گوڵە نەسرین دا چین چین زوڵفی زێرین پەخشان بکەیت. ئەوسا منیش لەبەر پێتدا ئەژنۆم دابدەم. بەڵام داخوا ئەم فرشتەی هیوایە کێیە؟ ئایا تەنیا کچێکەو دەیەوێ لە ئایدە (واتا مەعبەد)ی دڵداریی خەیاڵکردنا بەیەک بگەن؟ ئایا هەر لە بەر ئەوەی چونکە کچێکی جوان‌و دڵارامە؟.. شاعیر دەڵێ.. نا! لەبەر ئەمانەتی یە:

**وەرە نێو ئایدەت تا من لەبەر پێت دابدەم ئەژنۆ**
**لەبەروەی نا دڵارامی.. لەبەروەی چونکە باڵایی**

خودای شیعرو پەری هیوای، بڵێسەی هەستی بەرزی تۆ هەواڵی هاوڕەگ‌و خوێنی فرشتەی شۆخی (میدیایی)

**لە ڕووی چاکەو وەفاداری**
**بە یادی جامی دڵداری**
**لە مەستی خۆشی بم هێڵێ دروشمی خەندەکەی بایی**

دەڵێ لەبەر ئەوەی چونکە تۆ گیانێکی باڵای پەریی هیوای، بڵێسەی بەرزی، خودای شیعری، هەڤاڵی هاو ڕەگەزو هاوخوێنی، فرشتەی میدیایی! ئەمەش ڕەمزی کوردو ئاواتی کوردو ئازادی‌یە.

هەر خوێشی لە هەڵبەستی (ئەی ڕەقیب)دا دەڵێ:

**ئێمە ڕۆڵەی میدیاو کەیخوسرەوین**
**دینمان، ئایینمانە نیشتمان**

## دڵدارو چیرۆکی هۆنراوە

دڵدار شیعری لە زۆر لایەن‌و بابەت تاقی کردەوە، بابەتێک لەوانە پێیان دەگوت (مجادەلەی ئەفکار) لە شیعرێکی‌دا بەناوی (ئەی خوایە) دەڵێ:

**ئەی خوایە حاڵی عالەم حەقی شایانی‌نیە**
**میحنەت‌و ئیدباری زۆرو شەهدی بێ ژانی نی‌یە**

دەربارەی ئەم شیعرە مامۆستا کاکەی فەلاح دەڵێ: لە کۆمەڵگایەکی دوا کەوتووی وەکو کوردەواری‌و لە سەردەمی سی‌و چلەکاندا جۆرە وردبوونەوەو سەرنجێکی ئازایانەی دەربڕیوەو تەواو هەستی بە جیاوازی چینایەتی کردووەو چەند دیمەنێکی ڕیالیزمانەی بە ناسۆرەوە نواندووە. (٢-ل ١٠٦)

جگە لەم هەڵبەستە لەناو دەستنووسەکانیدا قەسیدەیەکی درێژی هەیە لەبەر ئەریت‌و دەستووری ئایینی ماوەی بڵاوکردنەوەی نی‌یە. د. مارف خەزنەدار بەشێکی لێ بڵاوکردۆتەوە. کەوا دڵدار بێ پەردە باسی خواو ئاین‌و مرۆڤ‌و عیساو مریەم‌و پێغەمبەرو بیروباوەڕە دەق پێدراوەکانی ناو کۆمەڵی خستوەتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستەوە. ئەمەش ڕەنگدانەوەی موتالاکردنی زۆری فەلسەفەو ئەدەبیات‌و کۆمەڵناسی‌یە. جگە لە هەڵبەست بە وتاریش لەم بابەتەی کۆڵیوەتەوە، وتارێکی بە عەرەبی بەناوی (ازلیە الکون) و (فی طریقی الی معرفه الحقائق انتقادات الی قلب البهائیین) هەیە. هەروەها لە وتارێکیش بە ناوی عومەری خەیام کە لە گۆڤاری (گەلاوێژ)دا دوو بەشی بڵاوکردۆتەوە لە سەربەستی بیرو ڕای ئایینی دەدوێ‌و بەشێکی مەبەستی خۆی بە هۆی بیرو باوەڕی خەیامەوە پێشان دەدا (ئەم وتارەش لەگەڵ ئەو وتارەدا کە لە کتێبەکەی عبدالخالق علاءالدین دا هەیە کەمێ جیاوازی هەیە.) ئەم هەڵبەستە بڵاونەکراوەش جۆرێک لە جۆرەکانی سەربەخۆیی و بەخۆڕاپەڕموون لە کەسێتی دڵدار پیشان دەدات. هەر لەسەر ئەم شێوازەش ڕۆیشتووەو گوێی نەداوەتە ئەوە کە ئەگەر ئەو جۆرە بابەتانە بە پەخشان بنووسرێت نەک هەڵبەست ڕەنگە جێگیر ترو چاکتر بێت.

بابەتێکی تری شیعری دڵدار، چیرۆکی هۆنراوەیە. لەم بارەیەشەوە چیرۆکی (لالەباس)و چیرۆکی (تووتنەوان)ی هۆنیوەتەوە. کە هەردووکیان نەک هەر لە ڕێبازی ڕیالیزم داندراون بەڵکو قەوماویشن‌و باری چینایەتی‌و چەوساندنەوەی جووتیاران‌و کرێکارانی کشتوکاڵ لەلایەن دەرەبەگ‌و بازرگانەوە پێشان دەدەن هەردووکیان دوو بەرهەمی دەستپێشکەری‌و ڕچەشکێن‌و ئەزموونکارین.

لالە باس جوتیارێکی پیرە، لەبەر ئەوەی شایەتی بەدرۆی بۆ ئاغانەداوە تا چەند موڵکێک بە ناوی خۆیەوە تۆمار بکات. تووشی ماڵ تاڵان کردن‌و دەربەدەری‌و دەردە سەری دێت، چیرۆکێکی قەوماوەو ناوی زەقی کەسەکانیشی خستۆتە بەرچاو لە گۆڤاری (گەلاوێژ)دا چەندو چوون‌و وەڵامدانەوەی پێویست کردو ژیانی شاعیر کەوتە بەر هەڕەشەی دەستدرێژی‌و لە گۆڤاری (نزار) زۆر بە توندی کردەوەی دەرەبەگایەتی ڕسوا کرد لە لایەکی دیکەوە، کاکە زیاد اغای غەفووری کەوتە نێوانەوەو ئاگری مەسەلەکەی کوژاندەوە.. کە پیاوێکی جوامێرو هۆشیار بوو، هەر چەندە ئاغای قارەمانی چیرۆکەکەش خزمی خۆی بوو بەڵام لێ نەگەڕا دەست بۆ شاعیر درێژ بکات. ئەوەی زیاتر قینی ئاغای قارەمانی چیرۆکەکەی هەستاند ئەوەبوو هۆنراوەکە لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوکرایەوەو کەوتە سەر زاری خەڵک‌و لە کۆیە زوو بە زوو ئەزبەرکراو دەگوترایەوە.

هەر لەم جۆرەش پاش دەساڵێک چیرۆکی (لالۆکەریم)ی جەمال نەبەز بڵاوکرایەوە، ئەویش لەسەر شایەتی نەدانی لالۆ کەریم لە دایەرەی (تەسویە) بۆ دەرەبەگەکان تووشی ئازارو چەوساندنەوە دەبێت. گرنگی (لالەباس) لەو زمانە ڕەوان‌و کێشە خۆماڵی‌یە پڕ لە ئاهەنگ‌و یەک قافیەیی‌یە ئاسانە دایە کە خستوویەتی‌یە سەر ڕێچکەی بەیت‌و چیرۆکێکی هۆنراوەی کۆنی کوردەواری بە (٢٩) دێڕ کێشەی نێوان کەسەکان لە شێوەی دەمە تەقی یەکدا لە نێوان نووسەرو جوتیارەکەدا بە وێنەی بزوتوو و پڕ لە ژیان داڕشتووە.. وەکو ئەم وێنەیە:

**چوومە (خراپە) ووتم ئاغاگیان**
**موڵکم هێ خۆمە. قەیدن لە تاپۆ**
**پێی وتم: پیرەی سمێڵ کلکە سە**
**یا تاپۆ بدە، یا بارکە بڕۆ**
**دووسێ ڕەش‌و ڕووت وڵاخیان هێنا**
**دەغڵیان بار کرد بە لێ لێ‌و لۆلۆ..).**

***

چیرۆکی (تووتنەوان)یش حەوت پارچەی لێ نووسراوەو بە ناتەواوی ماوەتەوە. چیرۆکێکی چۆنیەتی کێشەی تووتن چاندنە لە ڕۆژاتی شەڕی دووەمی گشتی‌دا.. چیرۆکی ئەوکەسانەیە کە بە ماڵ‌و منداڵەوە لە دەم زەلکاوو لەگوندی پڕ لە مەلاریاو دەردوو دووی (بیتوێن) ڕەنجی خۆیان بە پارەیەکی کەم دەخستە بارمتەوە، بە هیوای ئەوە کە بەرهەم فرۆشرا شتێکیان لێ دەست بکەوێ.. ئەوسا پارە پێشەکی لە بازرگان، زەوی لە ئاغاو ڕەنج‌و کارکردن لە جووتیارەوە. پاشان کە بەرهەم پی گەیشت پارەی بازرگان‌و باجی ئەم لاولای لێ دادەشکێنری ئەمجا بەشی بڕیار دراوی بازرگان‌و موڵکانە دیاری‌و دەکری‌و هیچێک بۆ جوتیارەکە دەمێنێتەوە یان نا!؟ ئەم جوتیارانە، بەتەواوی کرێکاری کشتوکاڵ بوون‌و کەتبوونە ژێر باری چەوساندنەوەی پارەدارەکان‌و زۆریان یەک دوو قوربانییان لەوێ بەجێ هێشت‌و بە لەشی مەلاریا شڕ کردوو و بەگیرفانی بەتاڵ گەڕانەوە.

دڵدار چیرۆکەکەی بە وەسفکردنی خێزانی ئاودێرێك و کەپرو ئاوماڵەکەی دەست پێ دەکات و باسی چۆنیەتی چاوچنۆکی و حیسابی خوارو خێچی پارەداران دەکات. کەوا لە سەرەتاوە دیارە جوتیارەکە قەرزار دەبێتەوەو لە بەرهەمەکەی بێ بەش دەکرێت. هەندێ نووسەر لە عاست ئەم دوو چیرۆکەدا تێڕوانینێکی نا ئارامانەیان دەربڕیوە. بە ساکاری و وێنە گرتنێکی فۆتۆ گرافیانەیان لە قەڵەم داوە. بەتایبەتی کە تەختە نیگارێکی هونەرمەندی واقیعی وەکو ئەمە دەبینین:

کەپرێکی دار گەز، نارێك دامەزراو
بە پووش و گەڵای چرۆ سەرگیراو
بۆ پارێزگاری خۆرەتاوو تۆز
بە چیخێکی شڕ سێ دەوری دراو
ئاوماڵی ئاودێر هەرزاڵەیی چووك
دوو پارچە بەڕی شڕی هەڵزراو
دوو لێفەی شڕی چڵکنی کون کون
سێ پیاڵەی چاو قۆریەکی شکاو
ئافرەتێك لەولا لاڵ و پاڵ کەوتوو
بێ هۆش لەبەر (تا)، لە برسا ژاکاو
منداڵێکی تر عومری شەش ساڵان
لەپەو ڕوو کەوتوو، بێ مل، پەشۆکاو
منداڵێکی تر ساواو بێ پەروا
بە دوو پارچە چل لەم لا داپۆشراو
وزەی بای گەرم و گزەی پۆلی مێش
تێکەڵ بوون لەگەڵ دەنگی: (باوە ئاو).

هاوڕێی ڕەخنە گری کارامەم کەمال غەمبار لە پاشکۆی عیراقدا ژمارە (٣٦)ی مایسی ١٩٧٩دا لە لێکوڵینەوەیەکدا بەناوی (ئاوڕ دانەوەیەك لە ڕێبازەکانی شیعری دڵدار) دەربارەی چیرۆکی هۆنراوەی لالەباس و تووتنەوان دەڵێ شاعیر:

((تەنیا واقیعە ڕوونەکەمان دەداتە دەست، دیوی دەرەوەی واقیعەکە بێ ڕتووش کردن؛ هەر چەندە شاعیر لە هەستێکی پاك و بێ گەردەوە لەوواقیعە ناهەموارە دەدوێ. بەڵام بەناخی مەسەلەکەدا ناچێتە خوارەوەو هۆی ئەو ژینە پڕ ئەشکەنجەو ناسۆرە دەرناخات و چارەسەری بۆ نادۆزێتەوە. بۆیە (هۆنراوە)ی توتنەوان و لالەباس مۆرکی ڕاپۆرتیی پێوە دیارەو بەم جۆرە هۆنراوانە دەڵێن هۆنراوەی ڕیالیزمی فوتۆگرافی. دڵدار لەو سنوورە وەستاوەو نەیتوانیوە بەرەو واقیعی ڕەخنەگرتن یان واقیعی شۆڕشگێڕی هەنگاو باوێت.))

ڕەخنەگران وەکو بیریان چووبێت ئەمە چیرۆکێکە نەك شیعر بەتەنیا وە لەسەر پەیڕەوی ڕێبازی واقیعی نووسراوە. لەم ڕێبازەشدا بەتایبەتی لەسەر دەمی ڕابەرانی بەراییدا، لەرقی ڕۆمانسیەکان سۆزو خەیاڵی لەڕادە بەدەر بەلاوە نرابوو و بەلایانەوە وابوو. ((دەبێ ریالیزم وێنەی مەڵبەندی کۆمەڵایەتی و دنیای هاوچەرخ بەشێوەیەکی وردی دڵسۆزانە (واتە ڕاستگۆیانە– ع. ب) بنوێنێ. بۆیە دەبێ ئەم نواندنەش تا لە توانادایە ساکاربێت بۆ ئەوەی هەر کەسێك بتوانێ تێی بگات). (٥–ل٤١)

ئەمیل زۆلاو دۆرانتێ و نووسەرانی ریالزم لە سەرەتای دامەزراندنی ڕێبازەکەیاندا وایان دەبینی کە ((ساکاری و دڵسۆزی دوو مەرجی بنچینەیی واقیعیەتن لە بەرهەمی هونەریدا ساکاریش وشەیەکە تابڵێی دەمەتەقێ و بێنەوبەرەی لەسەر کراو لە وشەکەی ڕیالیزم خۆی زیاتر مایەی جیاوازیی ڕای خەڵك بووە)) (٤–ل٤١)

ئەگەرچی ئەم ڕێبازە گۆڕانی بەسەردا هاتووەو لەم حاڵەی خۆیدا نەماوەتەوە. نواندنی واقیعیش نابێ هەر فوتوگرافیانە بێت، بەڵام تا ئێستاش ئەوە نەگۆڕاوە کە پێشان دانی ڕاستگۆیانەی واقیع بە ڕووداوو جێ و مەڵبەندو کەسەکان و باری دەروونیانەوە. بەچاوی هونەرمەندێکی ڕاستەقینە خۆی لە خۆیدا کارێکی هونەرییەو وێنەکە بێگیان نییە. ساکاریش ڕووێکە لە ڕووە ڕاستەکانی هونەر ڕێبازی واقیعی لەسەر دەستی دڵدارو چەند کەسێکی دیکە هاتە نێو ئەدەبی کوردییەوە. ئەگەر چیرۆکەکانی (خازێ) و (کەرە لۆتیی مەنووچەر) نموونەیەکی جوانی ئەم ڕێبازە بێ لە چیرۆکی پەخشاندا ئەوا توتنەوان و لالەباسی دڵدار نموونەیەکی ڕچەشکێن و پێشکەوتووی ڕێبازەکەن لە ئەدەبی کوردیدا.

لە شیعردا دوای ئەو شێخ سەلام و قانیع لەسەر ئەم ڕێچکەیە ڕۆیشتن و چەند نموونەیەکی ڕیالیزمیانەیان ئەخشاند. ئەنجا شاعیرانی تر لە وەسفی واقیعی دێهات و جوتیارو هەژارانی شاردا قەڵەمیان گێڕا. لەلایەکی تریشەوە پێم شك نایە لە مەیدانی هونەری چیرۆکی هۆنراوەی واقیعیدا کەسی تر پێش دڵدار ئەخشەیەکی کێشابێت و بەرهەمێکی شیاوی لێ بەدەست هێنا بێ، بۆیە من بەوچاوە سەیری ئەم بەرهەمە دەکەم کە هەوڵێکی تازەو ڕێبازێکی تازەو دەستپێشکەریی هونەرمەندانەی دڵدارە.

دەڵێن گوایا واقیعی ژیانی تاڵی جوتیارێکی چەوساوە چ وێنەیەکی وای تێدا نییە (چەشنە مووچڕکەو تەزوویەکی هەست و تاسەی دەروونی بە خوێنەر ببەخشێت!!) بەڵام وانییە.. دیمەنی کەپرێکی نارێك، ژنێکی لاڵ و پاڵ کەوتوو، منداڵێکی شەش ساڵەی بێ ملی ڕاکشاو ساوایەکی بەر دایکێکی نەخۆش و باوکێکی ماندوو.. ساواکە هاوار دەکات: بابە.. ئاو). کەس نییە جۆرە ئاوێکی بەدەمیەوە بکات. ئەم دیمەنە لەتەك دیمەنی کێخوای لەش ساغ و تێرو تەسەل کە بە سواری هاتووە کشتوکاڵ بەسەر بکاتەوە:

بڕنەو لەبەردەم. دەمانچە لە قەد
سمێڵ قیت و قنج، چاو کشت و وریا
موهەییا لە بۆ شەڕو جنێودان
توورە، شەڕانی، بی ئابڕوو حەیا.

لە واقیعەکەدا وێنەی دەروونی پڕ لە فێڵ و ڕەوشتی چاوڕاوو هەڵخەڵەتاندن لە لایەکەوەو وێنەی مەلای حیسابگری کوێخاش لە لایەکی ترەوە، بزووتنەوەیەك بە دیمەنەکە دەدەن:

کابرای لە گەڵ ئەم تومەز مەلا بوو
مەلایەکی گەنج تازە ڕیش تاشراو
هەرزەو دڵداری لە ڕوو ئەباری
سمێڵ باریکی، چاو کل تێکراو
مەلا دەفتەری لە باغەڵ دەرکرد
دەفتەر چ دەفتەر؟ پەڕپووت و گەچڵاو.

داخەکەم چیرۆکەکە تەواو نەکراوەو لە کۆتایی ئەم ژیانە تاڵە نازانین لە چ مەرگە ساتێك دەگیرسێتەوە. لە کۆتاییشدا دەپرسین ئایا وێنەی فۆتۆگرافی لە هونەر بەدەرەو هەموو فۆتۆگرافێك وشك و بی گیانە؟؟ دیارە .. نا..

## دڵدارو سیاسەت

دڵدار لە تەمەنێکی زووا کەوتە کۆڕی سیاسەت و بوو بە ئەندامێکی بزێوو چالاکی کۆڕی سیاسەت.. کەوتە کۆمەڵبەستی و کۆکردنەوەی سیاسی جۆشدراو بەگیانی کوردایەتی و داواکردنی مافەڕەواکانی کورد هەر لە قوتابخانەی ناوەندی و ئامادەییەوە تا کۆلیجی یاساو تا پارێزەری .. لە تەمەنێکی زوودا ژین و گورەزانی خۆی بۆ ئەو پێناوە تەرخان کرد..

دڵدار کە قوتابی ئامادەیی بووە لە کەرکوك وەکو د. مکرم تاڵەبانی دەگێڕێتەوە ئەوسا هاوڕێی خوێندنی بوو، لەگەڵ قوتابییانی تردا حیزبێکی بەناوی حیزبی (دارکەران) پێکەوە نا کە لە هەولێریشدا ئەندامی هەبوو. پاشان ئەم حیزبە گەشەی پێدراو ئەندامانی بەتێکڕای دەنگ (ڕەفیق حیلمی) یان بۆ سەرۆکایەتی حیزبەکە هەڵبژارد. دوای ئەوەی ڕای لەگەڵ دان ناویان کرد بە(هیوا)و دڵدار بوو بەسکرتێری حیزبی هیوا کەوا بە هەموو لایەکی کوردستاندا پلی هاویشت و زۆر لە خوێندەواران و ئاوداران و سەرۆکەکانی کورد بوونە ئەندامی..

دڵدار ئەگەر بەهرەدارو خاوەن کەسێتی‌یەکی هەڵکەوتوو نەبوایە چۆن قوتابی‌یەکی کۆیی هەژاری کەم خەرجی و شاعیرێکی دڵ ناسك و خەیاڵ پیشە دەبوو بە سکرتێری حیزب؟ بەڵام سەرۆکی حیزبەکە مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەبارەی دڵدارەوە دەڵێ:

((دڵدار لاوێکی زرنگ و خوێن گەرمە. خاوەن بیرێکی ژیرانەو پیرانەیە گیانێکی خاوێن و ڕۆحێکی بەرزی هەیە.)) (گۆڤاری گەلاوێژ -ژ(٩)ی ئەیلولی ١٩٤٣).

بۆ ناسینی کەسایەتی دڵداریش بەتایبەتی لەو ساڵانەدا کە سەرگەرمی کاری پارتی هیواو کە قوتابیی کۆلیجی یاسابووە لە بەغدا سەرچاوە نووسینێکی پتەوو پشتیوان ئەو چەند لاپەڕەیەکە مامۆستا مسعود نووسییەتی زۆر ورداو بابەتیانە لە کاکڵی کەسایەتی دڵدار ورد بووەتەوەو لێی دەگێڕێتەوە کە :

((دڵدار قوتابی‌یەکی دڵ زیندووی هۆشیاری مێشك کراوە بوو)) تێگەیشتم دڵدار گەنجێکی ئازایە، پڕ بە پێستی وشەی ئازاییش ئازایە. ئەم دیت ڕۆژێك لە ڕۆژان دڵدار قسە قووت بداتەوە یان لە هەڵوەست دابەزێ‌بە مەرایی کردن بەرامبەر ئەوازشت و یارمەتی ئەم و ئەو.. یەکێك بوو لە چالاکترین ئەندامانی پارتی هیواو گەرمترین دەمەتەقەی بە دەوری کردەوەو ڕەفتاری ئەو حیزبەو ئەندامانی بەرپا دەکرد.)) (٣-ل٦٢-٦٤).

مامۆستا مسعود ڕاست دەبێژێ. ئازایەتی و لە هەڵوەستی ڕاست دانەبەزین ڕەوشتی قارەمانانی ئەتەوەو خەباتی حیزبایەتی و سیاسەتە.

هەروەکو کۆڕی سیاسەت، دڵداری شاعیر، شایانی سەرنج دانە کە بە تەمەنێکی کورت و بەچەند دانە هەڵبەستێك توانی لە دیوانی شیعری کوردیدا جێی خۆی بکاتەوە. ئەگەر شیعر بۆ دڵداری سیاسەت کار مایەی هێزو پشتیوانی بووبێت بەڵام سیاسەت بۆ شیعر بەو جۆرە یارمەتیدەرو پشتیوان نەبووە بەڵکو سەرقاڵی و پڕ کاریی شاعیر بەکارو باری حیزبایەتی‌یەوە گەلێ دەرفەتی رامان و تەنیایی و سرووش و بیردامەزراوی لە دەست داوە. لەگەڵ ئەوەشدا دڵدار پێی خۆی لەو مەیدانەدا چەسپاندو شایانی وشەی مامۆستا بوو.

## دوا وشە

دڵدار لە تەمەنی ٣٠ ساڵێدا کۆچی دوایی کرد. من ناڵێم پێش سەردەمی خۆی کەوتبووەوە، بەڵام پڕ بەپڕ پێویستی سەردەم شۆڕگێڕانە کەوتە بزووتنەوە بۆ گۆڕین و گۆڕانکاری، لە زۆر بواری ژیانی کۆمەڵ و بیرو باوەڕی مرۆڤدا وەکو ئایین وە بێنەوبەرە (مجادلە)و دەمەتەقی لەسەر گەردوون و ئایین و نەریت و ڕەوشتەکانی ناو کۆمەڵ، سەربەستیی مرۆڤ و بەختیاریی خێزان و ئازادی و ڕووناکبیریی ژن، پێوەندیی چینایەتی پاشماوەی دەرەبەگی و عەشایەری.. هەوڵی دا لە پێناو گۆڕینی لێکدانەوەی سیاسی و بەگوڕخستنی خوێنی ڕۆڵەکانی گەل لە پێناو سەربەستی و مافدا. ئەویش بەپێردەنگی شۆڕشەوە چوو و لە داخوازی‌یەکانی سەردەم دوانەکەوت. بۆیە خۆی و کردەوەو بەرهەم و شیعرەکانی لە توماری بەرزی گەلەکەیدا لاپەڕەیەکی گەشیان پڕ کردوەتەوە.


سەرچاوەکان:

١-ڕەفیق حیلمی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی، بەرگی دووەم، چاپی دووەم.

٢-کاکەی فەلاح، کاروانی شیعری نوێی کوردی.

٣-عبدالخالق علاءالدین، دڵدار شاعیری شۆڕگێڕی کورد.

٤-دیمین کرانت، الواقیعیە، ترجمە د. عبدالواحد الؤلؤة

٥-ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (١٣٨٤ و ١٣٨٥) ٢٠و١٩٩٢/٢/٢٢

٦-ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە ٢٣١٧ ڕۆژی ١٩٩٥/١١/٦


**هەندێ لە شیعرەکانی دڵدار**

## منداڵی هیوا

منداڵی هیوا، کوولەکەی دڵان
تازە غونچەکەی نێو باغی گوڵان

هەرچەندە سەیری نێوچاوت دەکەم
نابینم گەردێ نە زۆرو نەکەم!

ڕوونی چارەی تۆ وەك ئاسمانی ساو
وەختێ لێی دابێ پرشنگی هەتاو

تیشکی ئومێدی سەر دڵی تاری
لە ئاسمانی ڕووت ئەدا دیاری

سیوەیلی چاوی بریقەدارت
ڕووناکی پاکی وێنەی ڕوخسارت

خەندەی بێ فێڵی لێوە ئاڵەکەت
ئەشئەی دووچاوی مەست و کاڵەکەت

بێ شك پێشەنگی موژدەی دڵشادین
یا نەغمەخوانی باخی ئازادین

ئومێدی دوا ڕۆژ ڕۆڵەی هیوا تۆی
خاوەنی فیکری بیکرو باڵا تۆی

هیوام بە تۆیە ئەی تازە منداڵ
بەیانی ببیە نموونەی میسال

ئەم قسانەی من کەوا بۆت ئەکەم
بزرینگێتەوە لە گوێتا هەردەم

ڕاست گۆبە دایم قەت درۆ نەکەی
وەختت بەبێ سوود تۆ لەدەس نەدەی

تێکۆشە دایم هەروەکو هەنگ بە
لە مەیدانی ژین ئامادەی جەنگ بە

ئەوا پێت ئەڵێم چاکی بزانە
ژیانی مەردی باری گرانە

نەك وابزانی وەك ژینی دوێنێ
دەخۆی و دەنووی لە ناو نوێنێ

ئەوە ژین نی‌یە کە وەك ژن بژیت
ئەبێ هەم ئازاو هەم مەزن بژیت

ڕۆژێ کە هاتو تۆ پێ گەیشتی
چاوت کردەوە لە ژین گەیشتی

ئەبینی ژیان کێویەکی بەرزە
ڕێگەی خوارو خێچ بە ترس و لەرزە

گشت کەندو کۆسپ، دەوەنە، دارە
پڕ لە دڕندەو دووپشك و مارە

سەر ڕێگەت هەمووی دانەیەو داوە
نادان و دانا لەوا داماوە

گیانەکەم ئەبێ تۆ لەم ڕێگایە
لەم دانەو داوەو چەرخ و دەزگایە

گەلێ ماندوو بێ ئارەق برێژی
ئەم دەردو ئێشە یەك یەك بچێژی

لەڕێی سەرکەوتن ئەبێ پێش کەوی
هەتا بکەوی زیاتر سەرکەوی

نیشانەی تیرەی خۆت بدەی ڕێگا
کە ڕیز ببەستن بڕۆن بە شوێنیا

تۆ ئەبێ چرای زانستی هەڵکەی
دەستم داوێنت ڕێگا ون نەکەی

بیرو هۆشی خۆت بەکار بهێنە
ئەم دانەو داوە یەك یەك بپسێنە

تاکو دەرکەوێ لە هەموو دنیا
چەندیان کرد بمرێ کەچی کورد هەرما




## گوڵی سوور

هەولێر ١٩٤٦

گوڵی سوور، ئەی کچی نەورۆز، ئەرێ کام دەس لە باغی ژین
لە بۆیەك دەفعە بۆن کردن، بەناکامی ئەتۆی هێنا
ئەوێستاکەش بەڕاکاوی
وەها بێ قەدرو تۆ زاوی
لەسەر ڕێگا فرێی داوی
لە جەورو زوڵمی ئەو دەستە پەری زادەی بەیان لەرزین
لەدەوری ئەم چڵەی لێی بووی پەپوولەی زەردو سوور گریا
منیش ئەی گوڵ دڵێکم بوو
دڵێکی پڕ لە ئارەزوو
بەسۆزی ئاوی حەز تینوو
لەناکاو لام فڕی بۆ لای کچێکی دولبەرو شیرین
ئەویش ڕیشەی لە دەست گرت و بەبێ ڕەحمی لە ژێر پێی نا
بە گریاوی و برینداری
بەڕوو زەردی و غەمخواری
بەبێ ئومێد لە دڵداری
گەڕاوە سینەکەی تارم، ئەوێستاش ئەی گوڵی غەمگین
لە تەهایی سەرینت بێ، دەهانێ ئەم دڵە، توخووا!!

## خەندەکەی بایی

بەغدا/١٥ مارت / ١٩٤٤

لە ئافاقی ژیانی ناهومێدیم خەندەکەی بایی
فرشتەی پاکی هیوامی نیشاندام واکە بیدوێنم
پریشکی تیشکی ئەستێرەی جوان ئیمشەو بە ئەسپایی
بەسۆزی هاتە نێو کونجی دڵی تاریکی پڕ خوێنم
دەسا دەی مەسدەری هەستی
دەخێرا لادەری پەســـتی
وەرە تا من بەڕازی تۆ نەمامی شادی بڕوێنم
***
جوانی غونچەیێ بوو وا کە پەنجەی ڕازی ڕاکێشای
دە سەیری چەند بەوەسلی زوڵفی خاوت شادو مەسرورە
لەڕووی ڕاستی ئەتۆش وەك ئەو گوڵێکی چیمەنی دنیای
کەچی تاجی دڵی هێشتا دڵت لەم حاڵە ڕەنجوورە
بەخەندەی نەرمی دڵ پاکیت
ئەخۆم سوێندێ بە ڕووناکیت
ئەگەر هەستێ بەژین وابێ لە جەرگی ڕاستیا دوورە
***
هەمووی نووری ژیانە نووری ئاسمانی شین
هەموو چەپڵەی گوشادی لێ ئەدەن هەرچی کە ئەی بینی
لەسەر ئەم خاکە گەردێکین دە ئێمەش ڕوو لە شادی بین
فەرامۆشی بکەین جارێ چەژنی تاڵاوی غەمگینی
بەدڵ ڕوونیو ڕووخۆشی
بە خەندە نەك بە خامۆشی
بنۆشین جامی دڵداری لەبەرکەین بەرگی ئەمرینی
***
دەهەڵسە بابناکەین مەعبەدی پیرۆزی دڵداری
لە تیشکی ڕۆژ لە شەوقی مانگ لە ڕەنگی پەلکە ڕەنگینە
کە هەر کامەی بلێ ی پاکە لە کردەی قودرەتی باری
نیشانەی کردگارێکەو بناغەی پەیڕەوی نیە
لە شوێنی پڕ لە هەستی بێ
کەرستەی خۆشەویستی بێ
لەنێو ئەم باغە بێ جێگە کە تۆم لێ دیت لە هاوینا
***
لە پەلکی تازە پشکوتووی ئەژاکاوی گوڵی نەسرین
کراسێکی سپی بێ گەرد دروستکە شەنگو دامەن شۆڕ
لەبەرکەو زوڵفی زێڕینت بەسەریا بێنە خوار چین چین
پەری تیم تیم، بەڕازو ناز، لە بۆت بێنن بنەوشەی مۆر
بە ئاوازو ئەواوتەبجیل
بهۆنن پێچەکەی ئیکلیل
ببەن کڕنوش بلێن: ئەی شۆخ، پەری زادەی گزنگی خۆر
***
ئەوا ئیکلیلی دڵسۆزی ودلارامیت ئەکەین پێشکێش
هەرچەپکەی خەمو مل کەچ سروشتی ئەوجەوانێکە
نیگارێ بوو، بە ناکامی بە گریاوی، بە ئێش و ئێش
لە ژین ڕۆیی ئەوێستاکە هەوێنی داستانێکە
بە یادی ئەو دڵەی تینو
کە چۆن هاتو وهاش دەرچوو
برۆ نێو ئاییندەو سەیری چەپیرۆز جاویدا نێکە
***
وەرە نێو ئابیدەت تا من لەبەرپێت دا بدەم ئەژنۆ..
لەبەروەی نا دلارامی لەروەی چونکە باڵایی..
خودای شیعرو پەری هیوای بلێسەی هەستی بەرزی تۆ
هەواڵی هاوڕەنگو خوێچنی فرشتەی شۆخی میدیایی
لە ڕووی چاکەوو وەفاداری
بە یادی جامی دڵداری
لە مەستی خۆشی بم هێلی دروشمی خەندەکەی بایی

## ئومێد

هەولێر ١٩٢٥

چاوەکانم لێڵو وێڵ بوو کوا؟ ستارەم دەرنەکەوت:
دڵ لە تاوی دەردی گڵپەی سەند وەکو ئاوڕو ئەوت
ڕۆژهەڵاتو زیندەگیدا گشتی عالەم کەوتە ئیش
چاوەنۆڕی ئوفقی دوورم ڕۆژی من کوا ؟ دەرنەکەوت
ئەی خودایە تاری ئیگبەت کەی ئەبێ لاچێ خودا؟!!
تابەکەی چەنگە چڕێ من سا لە گەڵ تۆ هەشتو حەوت
بەسیەتی دڵدار زەمانی شیعری بێ مەعنا ئەما
هەڵسە چارەی دەردەکەت کە بێ (تفکر) ڕێگە چەوت
بێتو ئەسپێ چەند ئەصیل بێ سواری چالاکی نەبێ
قابیلە دەرچێ لە مەیدانی جداڵو جێگە ڕەوت؟!!

## نائومێدی

بەغدا ١٩٤٥

زەدەی تیری نیگاهی فیتنە پەردازی نیگارێکم
گیرۆدەی داوی زەڵفی مشکباری گوڵ عوزارێکم

ئەوی نەیدیبێ ئێشی دڵو یا ئازاری دڵداری
چوزانێ من لە ئێشانی چە سووتانو فگارێکم

لە دەشتی نا ئومێدیدا بەدەم بایی قەدەر هەروەك
پەڵاشی وام کە هەر ساتە لە گۆشەی یا کنارێکم

بەڕۆژ ترساوو تاساوی زڕەی کاسەی شەوی پێشووم
بەشەو سەرخۆشی مەستی جامی قەهری ڕۆژگارێکم

ئەرێ ئەی دەستی دڵسۆزم بەبێ سۆز من مەڕەنجێنە
(سەبر) دەرمانی دل ناکا کەمن پەیوەندی یارێکم

سەرو مایەی جوانی خۆم لە ڕێگەی ڕازی ئەو دانا
لە دەرگانەی وەفای هێشتا هەژارو لێو بەبارێکم

ئەبێ چۆن پشت بە دڵداریم ببەستم تاکو ئێستێکە
گەلێ دوورین لە یەکتر ئەو لەبارێ من لەبارێکم

## ئەی خودایە

کەرکوك ١٩٣٧

ئەی خودایە حاڵی عالەم حەقی شایانی نیە
میحنەت و ئیدباری زۆرو شەهدی بێ ژانی نیە

سا ئەزانی بۆ چ ئەمن وا معرەضی شەکوا ئەکەم
تا بزانی قودرەتی تۆ حەددی ویجدانی نیە

زامەکەت بێ مەرهەم و بۆ گشتی عالەم ساریە
دەردەکەت زۆر نیشەدارو قەتعی دەرمانی نیە

ڕێگەیی بەش کردنی ڕزقت لە دونیا شاهدن..
هێندی کەس ئەفرادی لورت و هێندێ کەس نانی نیە

ڕۆژی فەرمووت (لیس للانسان الا ما سعی)..
هیچ کەسێکیش هێندی فەللاح ئیش و کێلانی نیە

ئیش ئەکات و ڕەنج ئەدات و ڕوتو قووت و زگ بەتاڵ
. ئاخری بێ سوود ئەمێنی ساڵ کە بارانی نیە

ڕائەمێنێ ڕەنجەڕۆ دەست لە ئەژنۆ قوڕ بەسەر
ڕاستە شاهی بێ شەریك باکی گەدایانی نیە

سا لە ڕێگەی ژین دزینی مەڕ ئەکا گیسك ئەبا
چونکە برسی و بێ نەوایە مایەیی نیە

ڕۆژێ هات و ڕۆحی دەرچوو لاشەکەی کەوتە ((ثری))
لێی ئەدەن بەم گورزە گەورە کە ئیمانی نیە

سا بەسایەی قودرەتت بوو ماڵەکەی بێ بەهرەما
خۆ قەزا بوو سرقەتی کرد ڕاستە گومانی نیە

بۆ چ لە دونیا ڕەنجەڕۆ بێبێ نەوابێ ئاخیرەت..
چونکە وەك من غائیلەی دڵ عزەتی گیانی نیە

گەر لە ئەفلاکا هەبایە حاکمێکی‌تر بەرقەرار..
سا ئەچووم ئەم ووت ((خودای من سوودی ئینسانی نی‌یە

ڕەنگە کەم دیدەو مەلایان هانی خەڵقی وابدەن
کوشتنی دڵدار حەڵاڵە چونکە ئیمانی نی‌یە

## ئەی ڕەقیب

کەرکوك

ئەی ڕەقیب هەرماوە قەومی کورد زوبان
نای رمێنێ دانەیی تۆپی زەمان

ئیمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوورو شۆڕشین
سەیرێکە خوێناویە ڕابوردوومان

ئێمەی ڕۆڵەی میدیاو کەی خوسرەوین
دینمان ئاینمانە نیشتمان

کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە
زیندووە هیچ نانەوێ ئاڵاکەمان

چەند هەزار لاوانی کوردی نەڕەشێر
بوون بە قوربانی و هەموویان نێژران

لاوی ئێستاش حازرو ئامادەنە
جانفیدانە جانفیدانە جانفیدان

لاوی کورد هەڵسانە سەرپێ وەك دلێر
سا بەخوێن نەقشی ئەکەن تاجی ژیان

کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە
زیندووە هیچ نانەوێ ئالاکەمان.

## عمر خیام

شاعیری خۆش گوفتاری کورد ((سەلام)) چوار خشتەکیەکانی خەیامی پێ بەپی بە کوردی هەڵگێراوەتەوە هەر بەچوار خشتەکی لە گەلاوێژدا بڵاوی ئەکاتەوە ئەم کارە زەحمەتە وانەبێ لە توانای هەموو کەسێکا بێ شیعر بە شیعر تەرجومەی کردو دەست لە بنچ و بناغەی مەعنا ئەسڵی نەدان عادەتەن دوو هێندی تەئلیفێك زەحمەتی پێوە ئەکێشرێ مرازم ئەمە نیە کە لەم نووسینەدا مەدحی ((سەلام و)) تەقدیراتی خۆمی نیشان بدەم بەڵکو چوار خشتەکیەکانی ((سەلام)) خۆیان مەدح و تەقدیراتی ((سەلامن بەلام مرازم ئەمەیە کە ((خەیام)) بە خوێندەوارانی خۆشەویست بناسم و وێنەی ژیانی ئەدەبی و مێژو خۆی بەووردی بەیان بکەم لە پێش ئەوەی کە بکەومە ناو ئەم باسەوە ئەمەوێ کە حیکایەتێکیان بۆ بگێڕمەوە ((وا ئەگێڕنەوە کە جارێك شەش کوێری زگماك لە هیندستانا تووشی فیلێك ئەبن. یەکێکیان ئەکەوێتە لای لوتی‌یەوە (خرتوم) دەستی لێ ئەدا ئەڵێ (فیل بە عەزیایێکی زۆر گەورە دەچێ، دووەمیان دەست لە ددانی ئەدا ئەڵێ ((نا فیل لەگەڵ نێزە فەرق ناکرێ)) سێ‌یەمیان کەوتبووە لا گوێ‌یەوە خۆی لە دووانەکەی پێشووی تووڕە کرد ووتی ((ئەمە یەك کوێری نازیرەك بدینم)) موناسەبەت چی‌یە؟ فیل لە باوەشینە ئەکات عەزیای چی؟ نیزەی چی؟)) چوارەمیان دەستی بە قاچەکانی کەوتبوو لە قاقای پێکەنینی‌دا ووتی ((ماشا الله، ماشاالله لەم عاقڵانە)) باوەشێن و کۆڵەکە زۆر لەیەکتر دوورن فیل بە کۆڵەگە ئەچێ)) پێنجەمیان دەستی لە تەنگەی فیلەکە گیرا زۆر تووڕە بوو بەسەر ئەوانی تردا قیژاندی ووتی وس وس، شەرم ناکەن ئێستا چاو ساغێکمان لابایە وای ئەزانی هەموو کوێرێك وەك ئێوە کەم ئیدراکن، ئەم ژاوە ژاوەتان لە چیە؟ فیل هەر وەك دیوارێك وایە برایەوە)) شەشەمیان

قسەکەی بڕی و زۆر پەست ببوو ووتی ((باوکم ئێوە زۆر غەڵەتن فیل نەبە عەزیا ئەبەنێزە، نەبە باوەشێن، نەبە کۆڵەکە، نەبەدیوار ئەچێ دەمت لە گوریس بدە. هەروەکو دەستت لە فیل دابێ چ فەرقی نیە)) فەرقی نیە مەی لێ ئەوویس بەکلکی فیلەکە کەووتبوو. جا ئەم شەش کوێرە لێ یان بووە کەشمەکەش قیرە قیر بەڵام حیکمەتەکە ئەمە بوو هەموویان ڕاستیان دەکرد وە هەموشیان درۆیان دەکرد. شاعیری شیرین گوفتار شێخ سەلام بەرە بەرە روباعیەتەکانی خەیامی هەر بەشیعر هەڵگێراوەتەوە، واپێ دەڕی لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوی ئەکاتەوە. ئەم کاری وازەحمەت و ئەم هونەرمەندیە لە پیاوێکی هونەرمەندی وەك سەلام ئەبێ ئەوەشانەوەی لای هەموو کوردێك مەعلومە. کوردو زوبانی کوردی لەبەرئەوەی کە زەمانێکی زۆر دوورو درێژە کەوتووتە بن باری نیگبەتی و بەدبەختی ئەو ملوانکە گەوهەرینەی کە پێشونان بۆ ئێمەیان بەجێ هێشتوە کە ئەویش (ئەدەبیاتە) پساتدراوو هەر دانەی پرژاوەتە لایێکەوە بۆ کۆکردنەوەی ئەم ملوانکەیە گەلێك کەس لە هەوڵ و تەقلا دایە بەلام لە لاییکی ترەوەش وەنەبی مێشکی کورد هەرچاوەنۆڕی ئەمە بکات، تا ئەدەبیاتی کۆنی خۆی بژێنتەوە ئینجا دەست بکا بە ئینتاجی ئەدەبی تازە داکەوتوو بەڵکو گەلێك لە شاعیرەکانمان تەك بەتەك مەدەنی یەتی حازرەو ئەدەبیاتی عەسری یەوە دەرۆن بێشك لەم کارە موبارەکەی دووایەدا کردەوەی شێخ سەلام کە ڕوباعیاتی (خەیام)ی مەشهوور دەکاتە کوردی، لە هێ هەمووان بەرزترە وەکو ڕۆژێکی بەهاری شەوق بەخش زۆر دلێرانە لە ئاسمانی کوردستان ئەبریقێنتەوە، ئەمەوێ کە لەم بابەتەوە تەقدیرات و مەمنونی یەتی ئەندێشان و ئەدەبیات پەروەرانی کورد پێشکەش شێخ سەلام بکەم بەڵکو روباعیاتە کوردیەکانی خەیام لە کوردستاندا هێندەی روباعیاتی ئینگلیزی خەیام کە لەلایەن (فیتز جرالدەوە) هۆندراوەتەوە حەقدەرو روح پەرەیە.

خەیام، تا ئێستا لە کوردستاندا هەروەکو لە جێگاکانی تردا ئاسراوە وا نەناسراوە، بەڵکو ئەم ئەستێرە بەرزە هەموو شوێنێکی رووناك کردۆتەوە هێشتا بە چاکی تیشکەکانی دۆڵ و شیوو ئەشکەوتەکانی کوردستانی رووناك نەکردۆتەوە، بەڵکو (اعتقاداتی) دینیەو شوهرەتی (خەیام) بەمەی پەروەر وەکو کفر ئامێزی بویتە باعیسی ئەمەی کە ئەم لە کوردستاندا وەك ئەناسراوبی وابێ. تالەم ڕۆژانەدا ڕۆژێك بە موناسەباتی باسێکی فەلسەفی بەسەر سەرەکی ناوی خەیام هاتە ناوەوە، (فەقێکی) تووڕە زۆر بە ئیفتخارەوە هیچ شەرمی کە هێندە وردو ئازك و باڵاو شاعیرانەیە ئەم زاتە بەرزە کورێکی هێندە بێ جەوهەرو کەودەنی لێ بووبێ هیچ باوەڕ نەدەکرا.

لەمەوە وادیار دەکەوێ کە تا وەختێکی زۆر ئێزیك هەتا شازادەکانی ئێرانیش کە عادەتەن زۆر ئەدەبیانەو بە سەقافەتێکی قەومی پەروەردە دەکران خەیامیان نەناسیوە ئەمەش هەموو سوورچی ئەم پیسانەیە کە دوژمنەکانی بۆیان ڕشتووە، وە یاخود ئەمە کە عومەر خەیام لە وەختی خۆیدا شوورەتی بە شاعیر وەرنەگرتووە وە ئەم روباعیاتانەی کە هەیە ئەغلەبی بە سورەتێکی (عرض) و لە موناسەباتدا یان (ئیرتجالیەن) و کتێبییش نەبوویتە سەبەبی ئەمەی کە ناوی بکەوێتە ڕیزی شاعیرانەوە تا (دەوڵەت شاە) لە کتابەکەی کە ناوی تەئریخی ئەدەبیاتی ئێرانی)یە ناوی خەیامی زۆر بەسەرەکی بردووە.

یەعنی ئەم زاتە بە شاعیرێکی خاوەنی ئەو میهنەتەی نەناسیوە، بالەم بابەتەوە چیتر لێی ئەدوێین، چونکە ئەگەڕێینەوە سەری.

بەگوێرەی ئەم تەدقیقاتانەی کە دکتۆر ((کریستەنس)) لە موقەدیمەی تەرجومەی روباعیاتی خەیامی‌دا نووسیوویەتی سالی (١٩٠٥)م (عمر خیام) ناوی بەتەواوی (غیاث الدین عمر بن ابراهیم الخیامی)یە لە سالانی (١٠٢٥٦-١٠٥٠) میلادی لەنیشابور (کە شارێکە لە خوراسان لە دایك بووە). ئەم تەدقیقە زۆر ئیختلافی لەگەڵ ئەو وەختانە هەیە کە موئەریخینی پێشوی ڕۆژهەلات، چونکە ڕەزا قولی خان هیدایەت لە کتابەکەی ناوی (مجمعی فصحاء)یە ئەڵێ خەیام لە سالی (٥١٧)هـ وەفاتی کردووە یەعنی ئەبێ لە سالی (١٠٩٩م) وەفاتی کردبێ. ئەحمەدی کوڕی عمری کوڕی عەلی (النیزامی العروض) کە قوتابی خەیام بووە لە کتێبەکەی کە ناوی (جهار مقالە) یە ئەڵێ:

لە سالی (٥٣٠هـ) زیارەتی قەبرەکەیم کرد ئەوساکە پێیان ووتم: کە مامۆستایەکەم چوار سال لەمەو پێش وەفاتی کردووە. بەم گوێرەیە ئەبێ لە سالی (٥٢٦هـ) وەفاتی کردبێ کە ئەبێ لە سالی (١١٠٨)م وەفاتی کردبێ وە هەروەکو دکتۆر عبدالله جەودەتیش ئەڵێ لە سالی (١١٢٣)م لە (مرو)دا وەفاتی کردووە یەعنی تەسادوفی سالی (٥٤١هـ) دەکا ئایا لەم سالانەکامیان ڕاستە؟.

هەرچی (دکتۆر عبدالله جەودەتە) بە گوێرەی تەدقیقاتی (دکتۆر کریستنەس) دەڕوا ئەگەر ئەم مودەتەی کە (کریستەنس) دایناوە کە لە بەینی نەکرد ووتی ((خەیام بە لەعنەت بی)) هیچ لەگەڵ مورتەدان فەرق ناکرێ هەر چەندێکی کەس گوێی نەدایە ئەم هەڵەوەڕیەی بەڵام گەر ئەم کابرایە لە مەجلیسێکی تر ئەم قسەی بکردبایە، ئەم قسانەی خۆی تەرەسوخ پێ دەکرد، ئەمەش دەلیلی دەرەجەناسینی (عومەر خەیام)ی مەشهوورە لەناو زومرەی زۆرترینی تیْ ئەگەیشتووان تازە چاوهەڵ هاتووانی کوردا. بەڵێ وەنەبێ (عومەر خەیام) هەرچەندێکی فەیلەسوفێکی شەرقی خاوەن مێشکێکی زۆر ووردی ئێرانی‌یە تا بەم دووایی‌یە ئەبێ کە لەلایەن موستە شریقەکانی ڕۆژئاواوە ئاشکرا کرا کەس نەیدەناسی. وە ئەم تەختە بەرزەی بۆ دروست نەکرابوو، چونکە عەسەبیەتی دینی و شوهرەتی خەیام بەلەدین دەرچوون و لەلایەن دوژمنەکانی یەوە لەوەختی خۆیدا پڕۆ پۆغاندەیێکی زۆر لە (عەلەیهی) کردن بووە سەبەبی ئەمە کە خەیام لە لەلایەن هاووڵات و هاوزبانی یەوە ناوی نەیێتە ناو ئاوان. تا دکتۆر عبدالله جەودەت بەگ لە دیباجەی تەرجومەی روباعیاتی (خەیام)دا حادیسەیێکی زۆر ئەنگێزی نووسیوەتەوە کە دەڵێ برادەری خۆشەویستم خەلیل خالید بەگ لە میستەر براون (M-Browne)ی بیستووەکە ئەو وەختەی (مظفر الدین) شاە لە ئاوروپا گەشتی دەکرد لە (لەندەن) وەفدێکی لە (جەمعیەی عومەر خەیام)ی چوو بووە لای کە داوای موساعەدەی ئەمەی لێ بکەن کە مەرقەدەکەی زۆر جوان هەڵبدرێتەوە ئەم وەفدە دەستیان پێ کرد کە زۆر موقەدەسانەو تەقدیرانە. ناوی (عومەر خەیام) ببەن وەمەکانەتی زۆر بەرزی عومەر خەیام لەبەینی میلەتدا عەرزی شاە بکەن کە لە گوفتارەکانی خۆیان بوونەوە ئینتزاری تەشکور نامەیێکی گەرمیان لە حەزرەتی شاە کردبوو، بەڵام شاە ڕووی کرذبووە (رئیس الوزراء)ی ئێران کە لەگەڵی بوو وەپێ‌ی وتبوو ((ئاقا این عمر خیام چە خریست)) یەعنی

ئاغا ئەو عومەر خەیامە لە چ تیرەیەکە؟ بەمە ئیزهاری جەهل ووەفدەکەی خستبووە دەریای حیرەتەوە. ئەگەر شاهیدی ئەم مەسئەلەیە (مستەر براوان)و (خلیل خالید بەگ) نەبووایە لە بابێکی کە خاوەنی ئەم قیتعە شیعرەی کە دەڵێ:

**از مشبکهای رنگارنگ پك پرتو فدات**
**کفر دین، دیرو شد مبشد زنارشد**
**ساقی روزی ازل چون جرعەی برخاك ریخست**
**تاك شد انکور شدمی شد نصیب یارشد**

سالانی (١٠٢٥ ١٠٥٠) میلادیە بگریتە پێش چاو بە گوێرەی تەقدیری دووایی کە (١٠٥٠م)یە ئەبی عومری (٧٣) ساڵ بووبێ، ئا ئەگەر بەپێی تەقدیری یەکەمی بێ ئەبێ عومری لە (٧٣) سالان تێپەڕیبێ. خاوەنی (مجمعی الفصحاء) کە ڕەزاخان هیدایەتە ئەڵێ: لە ساڵی (٥١٧)وەفاتی کردووەو بەدەلالەتی ئەم روباعیەی کە دەڵێ:

**هرگز دل من ز علم محروم نشد**
**کم ماندز اسرار مفهوم نشد**
**(هفتادو) سال عمر کردم شب و روز**
**معلوم شدکه هیچ معلوم نشد**

تەرجومەکەی بە کوردی ئەمەیە: (دڵی من هیچ وەختێك لە عیلم بێبەری نەبووەو کەم ئەسراری وابووە کەتێ نەگەیشتبم، حەفتاو دووساڵ عومرم رابوارد شەوو رۆژ لێم مەعلوم بوو کە هێشتا هیچم لێ مەعلوم نەبووە ٧٢ ساڵ ژیاوە جا (٧٢-٥١٧= ٤٤٥) لە دایك بووبێ کە تەسادوفی (١٠٢٧)م دەکا. بەمەوە قسەی ڕەزا قەولی خان هیدایەت زۆر نێزێکی بەیاناتی (دکتۆر کریستەنسن). کە ئەڵێ: لە (١٠٢٥) لە دایك بووە. وە ئەگەر بە گوێرەی ووتاری (نیزامی ئەلعرووس سەمەر قەندی) کە ئەڵێ لە ساڵی (٥٢٦ھ) وەفاتی کردووەو عومری خەیام بە (٧٢) ساڵ تەقدیر بکەین ئەبێ لە ساڵی (١٠٣٦) لە دایك بووبێ، بەڵام ئەم دەلیلە کە بەدەستەوەیە کە ئەڵێن (٧٢) ساڵ ژیاوە ئەویش ئەو روباعیەیە کەوا عرزمان کردووە ئایا بە دەلیلێکی مەقبوول لە قەڵەم ئەدرێ یان نا؟ بۆ ئەمەی کە ئیعتوباری پێ بکرێ ئەبێ دیسان ئەمەش بزانین کە خەیام لەو ساڵەی کە ئەم روباعیەی ووتووەو لە عەینی ساڵدا وەفاتی کردووە؟ بۆ ئەمەش هیچ ئیستنادگایێکمان بەدەستەوە نیە. بە چ مەعلوم خەیام لە پاش ئەوڕباعیە دەساڵی تریش نەژیاوە" لەبەر ئەمە تەئریخی لە دایك بوونی خەیام هەروەکو لەپێش چاوتانە شتێکی مەجهولەو بە روێکی تەقدیرییەوە باس دەکرێ. ئەم مودەتەی کە دکتۆر کریستەنسن دایناوە کە لەبەینی سالانی (١٠٢٥-١٠٥٠م) لە دایك بووە عیبارەتە لە (٢٥) ساڵ مودەت بۆ ئەمەی ببێتە مەیدانی تەقدیر بۆ لە دایك بوونی شەخسێك شتێکی زۆر نامەنتیقیە. لەبەر ئەمەی کە (عروزی سەمەرقەندی) خۆی خەیامی دیتووە زۆری خۆش وویستووە. بەڵکو (خەیام) مامۆستای بووە وابزانم لە تەقدیری تەئریخی و وەفاتیدا زۆر بە هەڵە نەچووە بەڵکو راسترینی وەختە بەڵام لەبەر ئەوەی کە تا ئێستا بە ڕاستی نەزانراوە کە خەیام چەند ساڵ ژیاوە، هەروەکو بەیانمان کرد. ئەم روباعیەی کە (ڕەزا قولی خان) ئەیڵێ دەلیلێکی زۆر بەقوەت نیە ئەتوانین کە هەر عەینی روباعی بەئەوەل محاوەلەی تەقدیری عومری (خەیام)



دابنێین و بڵێین (خەیام) هەر (٧٢-٨٠) ساڵ ژیاوە بەمەوە ساڵی لە دایك بوونیشمان بە سوورەتێکی مەنتیقی پێی تەقدیر دەکرێ کە مومکینە (خەیام) لەبەینی ساڵانی (١٠٣٦-١٠٤٤م) لە دایك بووبێ کە تەسادوفی (٤٥٤-٤٤٦) دەکا. وەشوێنی لە دایك بوونی (خەیام) دیسان لە موجادەلەیە هەروەکو حسێن دانشخان لە تەرجەمەی خەیامدا ئەڵێ:

خاوەنی (تەئریخی الالفی) کە (ئەحمەدی کوڕی نصر الله تتوی)یە ئەڵێ لە گوندی ((شمشاد)) کە تابیعی شاری (بەلنجە) لە دایك بووە (ص ٤٣) هەندێکیشیان ئەڵێن لە گوندی (بسنك) کە لە مەنتیقەی ئەسترابادە لە دایك بووە.

بەڵام (شەهروزی) قەزوینی خواندمیر ئیتیفاقەن ئەلین کە لە نیساپور- نیشاپوور) لە دایك بووە. وەئەمەش راستینی شوێنانە (یاقوت الحموی) لە کتێبەکەی کە ناوی (معجم البلدان)ە باسی شاری نیشابور ئەکا وەئەڵێ (شارێکی زۆر گەورەیە سەرچاوەی ئەقڵ مەندان و زانایانە، پیاوی زۆر گەورەی لێ هەڵ کەوتووە. لە ژیانی خۆمدا شاری وەهام چاو پێ نەکەوتووە. خەڵقی نیشابور بە لولە کۆزکان ئاو ئەبەنە ژێر ئەرزەوەو لەژێر زەمینەکانی خانووەکانیاندا ئەیخۆنەوە، هێندە ئاوی شیرینە کە وەختە بڵێم باوەر ناکرێ هەر وەکو ناسیبیتم زۆر خاوەن میوەو خێرو بەرەکەتە چەشنە (ڕێواسێ)کیان هەیە کە لە دنیادا شتی وانیە!!

وادیار دەکەوێ کە نیشابور شارێکی عیلمی و عولەمای زۆر لێ پێ گەیشتووە. تا هەروەکو دکتۆر عبدالله جەودەت دەڵێ: وا شورەتی سەندبوو کە هەرکەسێك لە نیسابور لەلای (موفق الدین عبداللطیف النیسابوری) دەرس بخوێنێ ئاخری زۆر خێرو ئەبێتە پیاوێکی گەورە لەبەر ئەمە دەستەدەستە خەڵق ڕوویان لە نیسابور دەکرد بۆ خوێندن و زۆر کەمیان وابوو کە هێندەی بەخت هەبێ لای (موفق الدین) دەرسی بەربکەوێ (ص٩٩٠) (میر خند) لە زوبانی (نظام الدین)دا ئەگێڕێتەوە- کەوا مەشهوور بووەکە هەرکەسێك لای (موفق الدین) خوێندبێتی ئەبێتە پیاوێکی گەورە لەبەر ئەمە باوکی- یەعنی باوکی (نظام الملك) ئەوی ناردۆتە نیسابور بۆ خوێندن کە چووە دوو قوتابی تری زۆر زیرەکی لێ چاو پێکەوتووە کە یەکیان (خەیام)و ئەویتریشیان (حسن الصباح) بووە.

هێندەی پێنەچوو کە (ابو القاسم) کە (نظام الملك) لەگەڵیان بوویتە دۆست، ڕۆژێك هەرسێکیان دادەنیشن. حسن الصباح پێیان دەڵێ: وا مەشهورە کە کەسێك لەبەر دەستی (موفق الدین) دەربچێ زۆر بەختیار ئەبێ؛ ئەوانیش ئەڵێن (بەڵێ) وە ئەڵێ ((ئێمە ئەگەر دەرچووین بە پیاوێکی گەورە بۆ دووەکانی ترمان چ بکا باشە؟)) ئەڵێن تۆ بڵێ ئەڵێ با هەرکامێکمان زووتر پێ گەیشت و شانێکی بۆ یارمەتی دووەکانی ترمان بکات.. لەسەر ئەمە پەیمان ئەبەستن ساڵەها بەسەر ئەم پەیمانەدا دەڕوا (ابو القاسم)ئەبێتە وەزیری (ئالب ئەرسەلان)ی دووەمین پادشاهی دەوڵەتی سلجوقیە وەلەقەبی (نظام الملك)ی ئەدرێتێ بۆ ئەمەی کە پەیمانەکەی بەبیر بێنێتەوە (خەیام) و (حەسەن الصباح) ئەچنە لای و داوای یارمەتی لێ دەکەن. ڕوونەکاتە خەیام وەزیفەیەکی گەورەی لە دەوڵەت عەرزدەکا، خەیام لەبەر ئەمەی کەزۆر لاگیری جاهو سەتوەت نەبوو. لە پەنایێکا ئیدارە کردن لەسەر تەدقیقاتی عیلمیەی زۆر لەم وەزیفە پێ خۆشتر هاتبووە بەرچاو وەبەم قالە جوابی وەزیر ئەداتەوە. جا (نظام الملك) ساڵی (١٢٠٠) مسقاڵ زێڕی لە واریداتی نیشاپور بۆ تەخسیس دەکات و ڕەوانی ئەکاتەوە، ئەم وەزیفەیەی کە بۆ خەیامی دانا بوو قەبوڵ نەکردبوو ئەیداتە (حسن الصباح) بەڵام لەدوواجارا وادەردەکەوێ کە (حسن الصباح) ئەیەوێ مەرتەبەی وەزارەتی لە (نظام الملك) زەوت بکات لەبەر ئەمە لە بارەگای (ئالب ئەرسەلان) دەرئەکرێ لەدووای دووساڵ (نظام الملك) بە (خەنجەری فیداییکی (ئیسماعیلی) کە مونەسیسی ئەم مەزهەبە (حەسەن الصباح) بوو ئەکوژرێ ((روضة الصفاج٤ص ٦١)).

وە بەگوێرەی تەدقیقاتی دکتۆر کریستەنسن پیاوێکی (ابو الطاهر) ناو موساعەدەی خەیام دەکا کە دەوام لەسەر تەدقیقاتی عیلمیە بکات. بە گوێرەی ئەم تەدقیقاتە ئەگەر ڕاست بێ، ئەبێ لە پاش کوژرانی (نظام الملك) موچانەی خەیام بڕابێ ئینجا ئەم (ابو الطاهر)ە بۆ خەیام ڕسکابێ ویارمەتی کردبێ. (عومەر خەیام) لە عیلمی فەلەکیات زۆر شارەزا، فەلەکیەکی مەشهوور بووە لە (١٠٧٤م،٤٩٢ھ) لەسەر تەکلیفی (نظام الملك) کە وەزیری (جلال الدین ملکشا) لەگەڵ حەوت (نجوم گەرانی تر) ناردنیە بەغدا لەوی سەرنجی ئەستێران بدا-رصد-ئەتیجەی ئەم سەرنجانە زیجی (ملکشاهیان) تەئلیف کردبوو.

خەیام هەروەکو لە فەلەکیات پێشڕەوی زانایانی گرتبووە بەر لە عیلمەکانی تریش بەدووا نەکەوتبوو بەڵکو لە (عیلمی ریاضیات) (متفوق) زۆر تێدا مەشغوول بووە. تا (ویپەك Woepehe) دەڵێ ئیبن خەلدون لە موقەدیمەکەیدا کە ووتوویەتی لە ١٦ مەخرەج زیاتر معادەلاتی جەبریە حەل کرد تا گەیشتووتە ٢١ مەخرەج، هەمووی بە ئەزەریات وریگایانی هەندەسی ڕاست ئیسپات کەر).

مرازی عومەر خەیام بووە ((هەروەهاش (غەزالی) (عومەر خەیامی بە ڕێبازێکی فەلسەفی ناسیوە، لە شوێنی خۆیدا ئیشارەت ئەدرێتە سەر تەدقیقاتی (غەزالی). شهروزی دەڵێ خەیام دکتۆرێکی زۆر شارەزا بووە. تا ئەمیری سنجار قیچکەی لێ دەرچووبوو زۆری لەبەر ئازار بوو. بۆ چارەکردنی لە دوای عومەر خەیامیان ناردبوو، عومەر خەیام لە جاری یەکەمدا دەست لە چاك بوونەوەی ئەمیر ئەشواو ئەم قسەیە بە وەزیری ئەمیر ئەڵێ وەلێ قولەڕەشێکی ئەمیر ئەمەی گوێ لێ ئەبێ و ئەچێ بۆ ئەمیر ئەگێڕێتەوە. لەدوای ئەمە کە خەیام زۆر ئیهتمام بە تەداوی ئەمیر ئەدا، ئەمیر قیچکەکانی چاك ئەبێتەوەو هێندێکیش حەز لە چارەی خەیام ناکات بەڵام ئەم حەز لێ نەکردنەی لا بەدیار ناخا عومەر خەیام لای ئەمیری سنجر بەناوی (تەدیم)ی ئەمێنێتەوە بەڵام مەسلەکی عیلمیەی خۆی بزر ناکاو پێ لە ئەتواری پارە پەرستی شاعیرانی ئەو وەختە نانێ، بەگوێرەی قسەی (ئەحمەد خەیات) ناوێك کە لەزەمانی خەیام ژیاوە وە کتێبێکی دەست خەتی لە دووا بەجێ ماوە ئەم کتێبە لە لایەن (دکتۆر عبدالله جەودەتەوە) تەدقیق کراوە. ئەڵێ (خەیام) حەز لێ کردەی شاعیری مەشهوری نیشابور (مەهەستی) ناوێك بووە. ئەم کچە شاعیرە لەگەڵ خەیامدا زۆر دڵشادانە لەقەسری ئەمیری سنجردا ژیاوە.

لاپەڕە ١١٤-١١٥ لە چاپی دووەم-ی کتێبی (عمر الخیام)ی (احمد حمد الصراف)ی محامی. -دڵدار-

## نامە

# کچم نەسرین

تالآت بووم ئەمویست کە ئەم چەند گفتارەی کەوا بۆت دەنووسم ڕوو بە ڕوو پێت بڵێم.. چونکە هەر لە مەیانی منو تۆدا ئەمایەوە.. ئێستا لێت دوور کەوتمەوە ئەم نامەیە پێشکەش تۆو هەموو کچانی کوردی وولآتو هاوتەمەنت دەکەم.

کچم.. تۆ منداڵ بوویت، کۆرپەیێکی شیرە خۆرەی زۆر ئێسك سووك چاوە کاڵە بچکۆلەکانت سێبووریو فێنکایەتیکی ئەوتۆی ئەبەخشیە دڵانەوە کە هەموو لایێکمان وەکو یەك بەخۆشیەویستیەوە ئەهەژاین، لەگەڵ لێوە باریکە سوورەکانت بە زەردەخەنەی بەریئی منداڵی یەوە ئێمەت ئەگرژاندەوە، بەزریقو باقو گاڵەو گیتەوە لە قاقای پێکەنینی سەرگەرمی دڵسۆزیمان ئەدا. هەروهاش بەماتیت ماتو بەگریانت دڵ تەنگو بەنەخۆشیت تێك دەچووین، بە تایبەتی (دایکت) بە خۆشیتەوە پێشڕەوی هەموومان بوو. وە لە نەخۆشیدا، یەکەم چاو بوو کە دڵۆپەی مرواریئی فرمێسکی زۆر گەرمی بۆ ئەباراندی چۆن خۆت دێتە بەرچاو؟ ئایا چەند کەسێك کە سەرچاوەی خۆشیان منداڵێك بێ چۆنی تەماشا ئەکەن؟ ئەم پرسیارە ئەبێ لە خۆتی بکەی.. تۆ منداڵ بوویت.. کچم.. وەکو پەروانەی دایكو باوکت لە دەورت هەڵ ئەسووڕان.. لە هەموو شتێك تۆیان بەسەر سنگی خۆیانەوە ئەنا لەسەرمادا جێگەی گەرمیان بۆ تەئمین ئەکردیو خۆیان ئەدایە بەر سەرما، لە گەرمادا جێگەی فێنکیان بۆ تۆ ڕەچاو ئەکرد خۆیان گەرمایان هەڵئەبژارد. لە نەخۆشیدا شەونخوونی تا بەیانیلە پشت سەرینەکەتەوە دائەنیشتنو ئێشکیان لێئەکێشای. هەرچەندە جارێك نکەت بهاتبایە لەبەر ئازارێکی دەرەوە ئەوان لە ژوورەوە جەرگیان لە زریکەی ئەدا، چیت بۆ بڵێم..؟ بۆ پارێزتنی تۆ هەرچی عەزابێکی کە تاڵ بووایە بەبێ پوونگانەوە هەڵیان ئەکوتایە سەر. تاتۆیان گەورە کرد تۆیان گەیاندە ئەم ڕادەیە، ئێستا گەورە بوویت، ئەم نامەیە بگرە دەست، بچۆرە پێش ئاوێنە گەورەکەی ماڵەوە سەیری نۆك بکە، خۆت ئەبینی؟ کە کچێنکی بەژن باریکی تازە هەڵچووی؟ هەموو ئازاری لەشت بەرەو گورێنێکی ئاشکار دەچێ بۆ پاگەیشتن بۆ جوانی کچایەتی بۆ ژیان ئەڕۆیت کچم. لە دوای ئەم عومرەتو لەو تەمەنەو بەو دوواوە ئەبێ کێ بتپارێزێ؟ ئایا هەر وەکو منداڵیت پارێزگاری خۆت ئەخەیتە ملی دایكو باوکتەوەو ئەگەر واشت باوەر کردبوو ڕاستە ئەوان ئەتوانن ئەم پارێزگاریە بکەن؟ جاران پارێزگاریت شتێك بوو کە لە توانای هەموو دایكو باوکێك دا هەبوو، چونکە منداڵێکی بچووك بوویت بەلآم ئێستا پارێزگاریت شتێکی ترە، بێجگە لە خۆت لە توانای کەسدا نییە. مرازم لەم پارێزیە، لەسەر ماو گەرماو نەخۆشیو بیماری زەرەرمەندو پارێزکردن نییە.

ئەم چەشنە پارێزیە بە غەریزە هەموو لایێکمان بەرامبەری ئامادە وەستاوین بەلآم مرازم پارێستنی رووحیتە مێشك خاوێن کردنەوە– خووڕەوشت بالاکردنو خۆڵە نەخۆشی کەلایەتی پاراستنە. مرازم لەم پارێستنە ئەمەیە کە هەموو تازە هەڵچوونێکی وەکو تۆ دوچاری ئەبێ کەم کەس وایە خۆی پێ لە بەردەستی رزگار دەکرێ.. تۆ وا گەورە بوویت.. لە مەکتەبیت.. ئەتوانیت کە نووسینان بخوێنی یەوە زینهار

بەهەموو شتێکی کە لە کتێبدا نووسراوە لە بابەت خۆشەویستیو حەز لێ کردنە پێی باوەر نەکەیوا من بۆ ئەمەی کە خۆشەویستیت بۆ بەیان بکەم پەلاماری چەند باسێك ئەدەم کە لەباسی ئێمە بەدەرەو پێویستیشە. خۆشەویستی ڕاستە هەیە، حەز لێ کردەش هەیە.. بەلآم حەز لێ کردەیێکی کە توشی بێ باکیو ڕوو هەڵماڵینو حەیا تکاندن درۆیە. حەز لێ کردەیی (مەلەکەییێکی) چاکەیە کە لە منداڵی یەوە لەو شەخسەدا مەوجوودە، بەشێك ئەم مەلەکەیە ئەتەنێ خاوەنەکە ئەباتە ئەو جێ بڵندیو کەماڵەوە شورەتو شانێکی زۆر گەورەی بۆ پێکەوە ئەنێ.

**لە بەغداوە یونس ڕەووف**

---

## وتار

# ناگزووری گەلایەتیمان

پێش دەستی

لە پێش هەموو شتێکا تکا لە خوێندەوارانی خۆشەویست دەکەم ئەمەندەی کە سەیری شێوەی نووسینی کوردی پەتیم ئەکەن چونکە مرازم لە نوسیندا ناگزووری گەلایەتیمان خستە بەرچاوەو بەس.. زۆر لە مێژە تا ئەتوانم بڵێم سێ چوار ساڵ لەمەوبەرەوە من هەوڵو تەقەلای ئەمە دەکەم کە بەشێوەیەکی ڕێكو ئاشکرا ناگزووری گەلایەتیمان (نواقص اجتماعیە) بخەمە بەرچاو، چەندم پێ خۆش بوو کاکە هووشیاریش لەسەر عەینی مرازو ڕێگەدا هەوڵی ئەدا. تا ڕۆژێکیان ئاواتمان بۆ ئەمە خواست کە لە گۆڤاری گەلاوێژدا جێگاییکی بە تایبەتی بۆ ئاشکرا کردنی ئەم ناگزووریانە دابنرێ هەموو قەڵەم بەدەستێکی کوردو هەموو برین لە دڵێکی تێدا کۆبکرێتەوە.

بەڕاستی کاك هۆشیار لە پێش هەموومانەوە زووتر پەلاماری قەلەمیدا لە ژمارە ۱۱، ۱۲ ساڵی ۱۹٤۲و ژمارە ۱–۲ ساڵی ۱۹٤۳ گۆڤاری گەلاوێژدا یەکێکە نووسینی لە ژێر ئەندێشەی کۆمەڵایەتی بڵاوکردەوە من یەك لە بارە خۆمدا وام ئەهێنایە بەرچاوی خۆم کە ئەم باسە وەك ئاگرێك بە تیزی بۆمبابیکەوە بنێ ی وا چەشنە قەڵەم بەدەستان ڕانەپەڕێنێ. بەلآم هەرچەندێکی ئەم نووسینە کورتەی فایق بۆ تەقاندنی بۆمباییکی باس کردنەوە بەس بوو بە پەرۆشی یەوە ئەڵێم ئەو بۆمبایەی کە هەردووکمان چاوەڕیی تەقینمان دەکرد بە چروك دەرچوو.

چوونکە ئەم نوسینە بەهێزە وەك نووزەیەکی بێهێزانە لە قوڵایی شیوێکا هاتبێتە دەرەوە لەبەر هەرا هەراو دەنگە دەنگی ناوە خۆمان کەس گوێی لەم دەنگە ژیان ئەنگێزە نەبوو. لەم ڕۆژانەی پێشوو دەستە هاوەنێك لە شوێنێکا دانیشتبوون باسی هەڵگیرسانیو ئەسبابی جەنگی گشتی (حربی العمومی) د.وەومان دەکرد زۆرم سەرسوڕما کە ئەم لاوانە وەکو سیاسیێکی ئینگلیز ڕەیا گەا پەرستێکی ئەلمان وەیا جانفیداییکی روسیا لە ناگرووری سیاسیو ئیقتسادی تەوازونی دەولی شارەزابوون. هێندێکیان هێندە بە شارەزایی خۆی بایی بو کە وەکو پێغەمبەرێك پاشەڕۆژی ئەم جەنگەو ئەتائیجی سیاسیو ئیقتصادی بۆ ئاشکرا دەکردین. بەلآم داخم ناچێ لە مودەی چوار سەعاتدا کە هەمەوی بە قیرە قیرو چەندو چوونمان رابوارد ساتێك خۆمان نکەوتە یادو ئەمەمان ئەهاتەوە بیر کە ئێمە کوردینو پێویستە کە لە پێش ئەوەی ئەوەی لە لاییدە وورد دەبینەوە لە خۆمان ووردەبینەوە ئەمە ئەڵێمو من حاشا لەمە ناکەم کە پێیوستە ئینسان ئاگای لە دەوران لە یاد بچێتەوە گوناهێکە کە مانەندی لێ بوردن نیە.

هەندێکتان وا ئەزانن کە لەباس چوومە دەرەوە، مرازی ئەساسیم لە یاد کرداوە. (ئەء) مەسئەلەی ناگزووری گەلایەتی هەموو روێکی تێدایە. هەموو ئاوازێك دەبەخشێ، بەڵکو گەلایەتی گەل پەرستی یەعنی کەم‌و کورتی ئەم گەلانە هێنانە بەرچاوە.

گەورەکانم خوێندەواران.. برایانی لاوانی خوێن گەرم.

هەروەکو (کوستاولوبون) لە کتێبەکەیدا کە ناوی (روحی سیاسەتە)دا ئەڵێ: ئادەمیزاد بە ووتاری عاتیفی زیاتر لە ووتاری ئەندیشە ئامێز دێتە بەرهەم‌و لێخورین ئەم ووتارە نایابەی کوستاو لوبولم لێرەدا بەیان کرد تا مقدما پێشەکێ– جوابی لە ووشەی نا"رینی ئو شتمان پەروەری زیاتر گوێی بۆ هیچ چەشنە ووتارێکی تر کلور ناکە)، ئەمەوێ کە لەلێرەدا حەقیقەتی بە هەلە چوونی خۆیانیان تێ بگەیەنم. ئەویش بە ڕێگایێك دەبێ کە ئەبێ دەستی ئەم لاوانە بگرم لە ئاوێنەی ڕاستیدا خۆی نیشان بدەم‌و پی‌ی بڵێم کاکی خۆم.. تۆ ئەمەیت ئێمە لەم حاڵەدایتە.)) گەلی کورد ئەم گەلەی کە هەزار ساڵە زیاتر چەشن چەشن دەردو سەنگە ساری ڕووی تێ کردووە. لە لەشیدا جێگیر بووە وەکو نەخۆشێکی موزمن میکرۆبەکانی تێکەڵ خوێن بووەو لە گەلێك مەزایای میللەتی شۆراندووە چونکە هەرچەندێکی بۆ ئیسپاتی هەموو میللەتێك دوو شت کافیە کە ئەویش زوبان‌و سنووری جوغرافیە بەلام بۆ ئەمەی میللەتێك بتوانی داوای پێ بکات زوبانی دەوێ گەلێك شتی ئەوتوی دەوێ کە ئێستاکە ناتوانم بیان ژمێرم هەروەکو عەرزم کردن، میللەتی کورد حاك‌و زوبانی هەیە بەلام لە گەڵ ئەمەش بەنەبوو دانراوە. میللەتی کورد مەوجودە بەلام نەخۆشە، گیانی تێدایە بۆیە ناتوانێ ڕاست ببێتەوە زوبانی هەیە بەلام ناتوانێ بدوێ چاوی هەیە بەلام نابینێ گوێی هەیە بەلام نابیسێ ئەتوانم کە میللەتی کورد وا دانێم کە تازە گرانەیی بەردابێ بەلام لە تەوژمی ئەم نەخۆشی‌یە مێشکی تێك چوو چاوی گران گوێ کەرو زوبانی لەنگ بووبێ. هەروەهاش هێشتاکە لە جێگادا کەوتبێ‌و نەتوانێ ڕاست ببێتەوە، لەبەر ئەوە لاوازی‌و بێ تاقەتی خۆی، هەرکەسێك لەم حاڵەی کە ئەم نەخۆشە تێدایەتی داوای ئیش‌و کارو ڕاپەرین‌و جوڵانەوەی لێ بکات بێشك مرازی لە کوشتن زیاتر چیتر نیە.

خوێندنەوارانی پزیشکەکانمان ئەمە زۆر چاك ئەزانن کە ژیانی نەخۆشێکی کە لە دەوری چاك بوونەوە نەقاهەت دابێ. گەلێك لە ژیانی نەخۆشێکی نەخۆش خەتەر ترە. چونکە چاك بوونەوەی نەخۆشێکی نەخۆش بەدەرمان‌و دەرزی باشەوە بەستراوە کە ئەویش کاری دکتۆرێکەو بەس، بەلام نەخۆشێکی لە دەوری نەقاهەت دابێ ژیان‌و هاتنە سەرەخۆی بە خواردنی باش‌و ڕێکی دانی ئەم خواردەمەنیانە بەستراوە کە ئەمە لە موراقەبەی دکتۆر بەدەرە زۆر مومکینە چەشنە خواردنێك بۆ نەخۆش دانەنێ بەلام نەخۆشەکە خۆی حەز لەم خواردنە ناکات‌و داوای یەکێکی تر نەکا. خزم‌و کەس‌و کاری لەبەر خۆشەویستی وەیا لە نەزانینا بە گوێی دەکەن نەخۆشەکەی لێ هەڵدەوەشێتەوە بۆ ئەمە پێویستە کە دکتور زانی نەخۆشەکەی لە دەوری چاك بوونەوەیە زۆر بە ووردی بی هێزی لەش مەعیدەی نەخۆشەکە تەقدیر بکات بزانێ کە چ چەشنە خواردنێکی سووك زووترو زۆرتر هێزی دەدات. هەر ئەوە بۆ چاك کردنەوەی نەخۆش بەس نی‌یە بەڵکو پێویستە کە ئەم کەسانەی خواردن ئەدەنە نەخۆش بزانن کە چ دەکەن وەزۆر بەدیقەت میقداری خواردن‌و دەم‌و جەمی بۆ ڕاچاو بکەن. هەرکامێکیان لە کاری خۆیاندا درێغیان کردوبایە بە هەلە چوونی بێشك ئەم نەخۆشە لە پاش چاك بوونەوە ئەکوژن وەیا دووبارەکی تووشی نەخۆشی‌یەکی جارانی وەیا نەخۆشێکی لە هێن جارانی گرانتر دەکەنەوە.

ژیانی میللەتێك وەکو ژیانی فەرد وایە هیچ فەرقی نیە. هەر چونیکی ئەو بەنەخۆش دەکەوێ ئەویش بەنەخۆش دەکەوێ. وە بۆ چاك کردنەوەی دکتۆری دەوێ دەرمانی گەرەکە.

# مەرگی شاعیر

نوسینی عبدالخالق علاءالدین

پاش تەاوکردنی کۆلیجی حقوق واتە لە ساڵی ١٩٤٥دا مەرگ تەنیا سێ ساڵ ماوەی ژیانی دڵداری داوە.

ئەو سێ ساڵەش خەریکی پارێزەری (محاماة)و خوێندنەوەو نووسین بووەو لە گەڵ نەساغیشا هەر ئاشنا بووە بە تایبەتی دوو نەخۆشی (ڕۆماتیزم‌و ئاوسانی دڵ) بەردەوام ئازاریان داوە.

لە ڕۆژی ١٩٤٨/١١/١٢ کە تازە لە نەخۆشیدا ڕاست ببۆوە لە کۆیەوە بۆ هەندێ کاروباری خۆی دێتە هەولێر، لەگەڵ کاك (عومەر حەبیب)دا لە یانەی فەرمانبەران نان دەخۆن‌و دەچنە سینەمای (حەمرا) لە گەڕانەوەدا لە نزیك ئوتێل (فەرەح) برادەرەکەی لا دەداو دڵداریش بە شەقامی (مظفریە)دا بەرەو تەیراوە شۆڕدەبێتەوە بۆ ماڵی سەعدی برای. کە دەگاتە ڕاست ئوتێل (کوکب الشمال) ڕەت دەباو دەکەوێ، بەهەربارێك خۆی دەگەیێنێتە چایخانەکەی بن قەلاتێ‌و ڕادەکشێ، تومەز بە خواردنەکەی یانەکە (میمبەری سورەوەکراو) دەبێ (تەسەموم) دەکات، خەڵقەکەش وایان زانیوە سەرخۆشە بە عەرەبانە دەیبەنە خەستەخانە، بەلام بێ بەختی دکتوری (خەفەر) ئەوشەوە لە ماڵی دۆستێکی خەریکی مەی خواردنەوە دەبێ بەسەری ڕاناگات

ئەوە بەگوێرەی دیوانە چاپکراوەکەی–چاپی کوردستان– بەلام لەلایەکی ترەوە کاك موستەفا عوزێری بە جۆرێکی تر باسی بۆ کردم‌و گوتی:–

((دڵدار لەگەڵ (عومەر حەبیب)ی برادەری پاش چوار پێنج سەعات ماندی بوون‌و سەرما چێشتن بە درەنگ وەختێك لە کۆیەوە دەگەنە هەولێر، ئێوارەی ئەو ڕۆژە من چاوم بە دڵدار کەوت پێم گوت: بامیوانداریت بکەم‌و بچین بۆ سینەمای سەلاحەدین گوتی: بەنیازین لەگەڵ عومەر بچینە سینەمای (حەمرا).. ئیتر وەك لەپاشا زانیم دوای ئەوەی ئێوارە لە یانە نان دەخۆن کە (میمبەری سورەوە کراو) دەبێ دەچنە سینەمای ئاوبراو، بەلام پێش ئەوەی فلیمەکە کۆتایی بێ دڵدار دەگوشرێ‌و دێتە دەرەوە، وا ڕێك کەوت ئێمەش فلیمەکەی سەلاحەدینمان بەدڵ نەبوو زوو بێزار بووین‌و بەجێمان هێشت، کاتێ بەرەو ماڵ دەهاتینەوە غەریبە غەرب‌و قاڵەباڵغێکی زۆر هەبوو کە پرسیم گوتیان: ئەوە پیاوێکی سەرخۆش کەوتیە، هەرچەندە دڵدار هەوڵ دەدا بە خەڵقەکە ڕابگەیێنێ محامی‌یەو سەرخۆش نیەو نەخۆشە بەلام توانای ئەوەی نەمابوو سەرەڕای زمان گیرانەکەشی کە کاتی ئاسایی هەی بوو، ویستم بچم بزانم کێ‌یە؟ هاوڕێیەکەم (ڕۆستەم جەبار) نەیهێشت گوتی: چیت داوە لەو هەرایە.. ئەوە بوو بەهۆی ئەوەی کە من ئەو دەرفەتەم لە دەست بڕوات‌و نەزانم ئەو نەخۆشەی بەسەرخۆشیان داناوە ئەوە دڵداری شاعیری هاوڕێمەو لێی قەوماوە، ئەگینا بەهەربارێك بوایە چارەسەریەکی وام دەکرد مەگەر خوا دەنا سەرئەنجامی بەو کارەساتە نەهاتباو منیش ئەوەندە داخ‌و حەسرەتم بۆ نەدەخوارد.

بۆ سبەی لە خەڵکیم زانی بەو عەرەبانەی کە کۆڵ هەڵگرو حەممالەکان بەکاری دێنن دەیبەنە پۆلیسخانەی سەرا گۆیا سەرخۆشەو لەگەڵی بکەونە توێژینەوە، کەچی مفەوەزی خەفەر (ئیبراهیم حەنا) ئەو شەوە لە ماڵی دۆستێکی خەریکی خواردنەوەو یاری پۆکەر دەبێ. دڵداریش بەوشەوە ساردەی زستان بێ کەس‌و بێ چارە لەوێ دەمێنێتەوە، جگە لە ماندی بوون‌و سەرمای تری ڕێگای کۆیەو ئاتەواوی باری تەندروستی‌و لەوانەشە خواردنەکەی یانەش لەبەر چەوری کەم‌و زۆر کاری تێکردبێ، ئەوانە تێکڕا هەمووی بوونە هۆی کارەساتی کۆچی کتوپڕی دڵداری شاعیرمان..

# دڵدار لە بیرەوەری شاعیرو ڕۆشنبیراندا

د. کەمال مەعروف

دڵدار شاعیرو تێکۆشەرێکی خاوەن هەڵوێستو، سەراپای ژیانی پڕ لە خەباتو ڕەنج دان بووە، لە پێناو گەلە ستەمدیدەکەیدا؛ دڵدار کە لە ژیاندا بوو بیری ئەوەی کردۆتەوە بیرەوەریەکانی خۆیمان بۆ تۆمار بکات، تۆمارکردنێك بەشێوەیەکی هونەری زۆر جوانو لێ هاتووانە کە بەنموونەیەکی بەپێزو دانسقە دادەنرێت لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا. دڵدار لەو تەمەنە کورتەیدا، چالاکیو جموجۆڵی پڕ بەهای خستۆتە ڕوو، چ وەك شاعیر، چ وەك خەباتکەرێکی مەیدانی سیاسەت ڕۆڵی دیارە. شیعرەکانی ئەی ڕەقیب، گوڵی سوور، خەندەکەی بایيو چەندانی تر بەرهەمی سەرکەوتووی دڵدارن، دڵدار دەخەنە ڕیزی شاعیرە گەورەکانی کورد، ئێمەی کورد قەرزاری دڵداری شاعیرین، بۆیە پێویستە ئاوڕی لێ بدەینەوەو پەیکەرێکی نازداری لە شارەکەی کۆیە بۆ بکرێت. کە شایەنی ئەم ڕێز لێنانەیە. لە کۆتایی بیستەکاندا لە بەغدا بڕیاردرا کە کۆمەڵێکی نهێنی دابمەزرێت ئەم کۆمەڵە لە ١٩٢٧/٧/١٠ دامەزرا، بەناوی (کۆمەڵەی پشتیوان) لقی پشتیوان لە هەموو شارەکانی کوردستاندا بڵاوبۆوە، ئەحمەد خواجە دەڵێ:

((لەگەڵ ئاسەف ڕەئووف کۆیی تێئەکۆشاین زۆر نامەی نهێنیمان ئەنووسی بۆ متەسەڕیفو وەزیرەکان و داوای نووسینو خوێندن بە کوردی ئەکرا.))

ئاسەف ڕەئووف کە خەریکی کاری سیاسی بوو، بۆیە برادەرانی بۆ لای دەهاتن پێکەوە بەنهێنی کاری سیاسییان ئەنجام دەدا، بۆ ئەم مەبەستەش ئاسەف (دڵدار)ی هێناوەتە مەیدانی خەباتەوەو کاری سیاسی پێ کردووە، (دڵدار)ی شاعیر ساڵی ١٩٣٨ لە شاری کەرکوك دەبێتە ئەندامی (کۆمەڵی دارکەر) ئەم کۆمەڵەیە لاسایی کردنەوەی کۆمەڵەی کاربۆناری ئیتالیا بووە، نوری شاوەیس دەڵێ: (لە پاییزی ١٩٣٨دا لەبەر ئەوەی قوتابخانەی ئامادەیی لە شاری سلێمانی نەبوو. لەگەڵ عەبدوڵلا تۆفیق جەوهەر چووینە کەرکوك من چوومە پۆلی چوارەمی زانستیو عەبدوڵلا جەوهەر پۆلی چوارەمی ئەدەبی، لەوێدا یەکترمان ناسی لەوانە قوتابی ترمان ناسی کە لە کۆیەو هەولێرەوە هاتبوون لەوانە جەلال ئەحمەد بەگو (دڵدار)ی شاعیر (دڵدار) لە ئێمە گەورەتر بوو، ئێمە زۆر خۆشمان دەویست، لەکاتی قسەکردندا زمانی دەگیرا، خۆمان پێ ڕانەدەگیرا دەمان دا قاقای پێکەنین، دڵدار دەیووت بەسە، تووڕە نەدەبوو لێمان بێزار نەدەبوو، پاش ماوەیەك پەیوەندیمان بەهێزبوو بڕیارماندا کۆمەڵێکی سیاسی دامەزرێنین بەناوی (کۆمەڵەی دار کەر) کۆمەڵەی دار لقی لەهەولێرو بەغداو خانەقین پەیداکرد، پاش ئەوەی ژمارەمان زیادی کرد، بیرمان کردەوە کە ناوی کۆمەڵە بگۆڕین لە مانگی نیسانی ١٩٣٩ کۆبوونەوەیەکی فراوانمان بەست ئەندامانی بەغداو کەرکوكو کۆیەو سلێمانی بەشدار بوون، لە کەرکووك لە هوتێلێ کۆبووینەوە، ڕێکەوتین کە ناوی دارکەر بە کۆمەڵەی هیوا بگۆڕین، ئەوانەی لەم کۆبوونەوەیە بەشدار بوون منو یونس دڵدارو کاکە حەمەو فاضل طالبانيو نورالدین بهاءالدین بوون ئامانجی دوورمان یەکگرتنی پارچەکانی کوردستان بوو بەڵام ئاماجی نزیکمان ئیدارەیەکی سەربەخۆ بۆ کوردستان بوو (دڵدار) لە چلەکاندا لە کۆلیژی یاسا لە بەغدای خوێندووە.

لە ساڵانی ١٩٤٦-١٩٤٧ دا دڵداری شاعیر دەبێتە ئەندامی (حیزبی تحرری وطني) (حیزبی ڕزگاری نیشتمانی) کە ڕووکارێکی حیزبی شیوعی عێراق بوو هاوڕێ حسین محەمەد شەبیبی ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی عێراق ڕێکخەرو سەرکردەی بوو، جمو جۆڵو مەیدانی خەباتی لە مەیدانی هەموو حیزبەکانی دی پترو فراوانتر بوو. وەکو دڵزار لە بیرەوەریەکانی‌دا دەڵێ: دڵزار لەسەر داوای (دڵدار)ی شاعیر دەبێتە ئەندامی پارتی ڕزگاری نیشتمانی، لەم ڕووەوە دڵزار دەڵێ: هێشتا مانگێك بەسەر گەڕانەوەمدا تێنەپەڕی بوو کە لە سەرداوای یونس ڕەئووفی دڵدار پاش نیوەڕۆیەك عوسمان مستەفا خۆشناو بردمیە ماڵی دڵدار، دڵدار پاش چاکو چۆنیەکی گەرم بەکاك ئاسەف برا گەورەی ناساندمو پێی گووت ئەوە (دڵزارە) کاتێکی خۆشمان لەگەڵ دڵدارو کاك ئاسەن بەسەر برد لەو ڕۆژەدا لەگەڵ دڵدار دابووینە دوو هاوڕێو دوو هاوبیر، زۆر هانی دەدام کە شیعرەکانم لە گۆڤاری گەلاوێژ بلاوبکەمەوە. لە شاری کۆیە کۆمەڵێ کارو باری سیاسی لەگەڵ دڵداری شاعیر بە ئەنجام گەیاندووە، لەم بارەیەوە دڵزار دەڵێ: لە نەورۆزی ١٩٤٨ دا گەورەترین ئاهەنگمان گێڕا، یونس ڕەئووف (دڵدار)و من بەیەکەوە بەڕەسمی ئیجازەی نەورۆزمان لە قایمقامی کۆیە وەرگرت کە ئەوسا (صبحي علي) بوو، لە ئاتووکی بەفری قەندییان شوێنمان خۆش کردو شانۆیەکی زۆر ڕێکوپێکمان پێکهێنا، زۆربەی زۆری جەماوەری کۆیە بەپیاو ژنەوە بە قایمقامو پیاوانی میریو ئاینیشەوە بەشدارییان تێدا کرد.

# ژیانو بەرهەمەکانی دڵداری شاعیر بە زمانی فەڕەنسی

ژیانو بەرهەمەکانی دڵداری شاعیر (Lavie et oeuvre du poete Kurde Dildar) ناونیشانی کتێبەکە کە بەزمانی فەڕەنسی بڵاوبۆتەوە، چاپخانەی موریس توریس لە پاریس ساڵی ١٩٨٩ بەچاپی گەیاندووە. لەم کتێبەدا کەمال مەعروف لە سەرچاوە خۆماڵیو بیانی‌یەکانی دڵداری شاعیری کۆڵیوەتەوە. پاشان ژیانی سیاسیو ڕۆشنبری دڵداری خستۆتە ڕوو، شیعرەکانی بەسەر سێ بەشدا دابەش کردووە، دڵداری وەکو تازەکەرەوەیەك پێشان داوە بە بەڵگەی زانستی هەروەها نموونەی شیعرەکانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسی، ئەم کتێبە پێشکێشی ئامۆژگای دیراساتی ڕۆژهەڵاتی لە سۆربۆن کراوە بۆ وەرگرتنی دبلۆمی باڵا (Maitcise)


سەرچاوەکان :

١-عبدالخالق علاءالدین، دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، چاپخانەی دار افاق عربیه. بەغدا ، ١٩٨٥.

٢-ئەحمەد خواجە، چیم دی، چاپخانەی ڕاپەڕین، سلێمانی.

٣-نوری شاوەیس، من مذكراتي، منشورات حزب الشعب الديموقراطي الكردستاني، ١٩٨٥، ل٢١.

٤-مەسعود محەمەد، گەشتی ژیانم، چاپی ستۆکهۆڵم، ١٩٢٢، ل ٢٣٧.

٥-ئەحمەد دڵزار، بیرەوەری ڕۆژانی ژیانم، چاپخانەی بنکەی سارا، ستۆکهۆڵم، ١٩٩١، ل ٧١.

